

فیتنەو ڕووداوەکانی ئاخری زەمان

# لە دوهەیماء

## هەتا کۆتایی

نووسینی: کاوه أسعد

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ



## ناسنامەی کتێب


ناوی کتێب: فیتنەو ڕووداوەکانی ئاخری زەمان لە دوهەیماء - هەتا کۆتایی

نووسینی: کاوه اسعد

دیزاینی ناوەوە: عبدالله خاکی

دیزاینی بەرگ: محمد سیانی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی

ساڵی «٢٠٢٥»ی پێ دراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی نووسەر

الحمد لله رب العالمين، حذرنا من الفتن ما ظهر منها وما بطن، وأشهد أن لا إله الله وحده لا شريك له يعلم السر والعلن، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، أمر عند ظهور الفتن بالاعتصام بالكتاب والسنن، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه وسلم تسليماً كثيراً.

له سەردەم و زەمانێکدا دەژین دونیا بەشێوازێك تێکچوە و خەڵکی بەگشتی و ئوممەتی ئیسلام بە تایبەتی بەجۆرێك سەریان لێ شێواوە کە هەرکەسێك بە چاوی بەسیرە و فیڕاسەوە لێی بڕوانێت دەزانێت کە ئەم سەردەم و قۆناغە یەکێکە لە سەختترین ودژوارترین قۆناغەکانی دونیا!! زۆربەی هەرە زۆری نیشانە بچوکەکانی هاتنی کۆتایی دونیا دەرکەوتون و فیتنە و جەنگ و ئاژاوە زۆربەی وڵاتانی گرتوەتەوە،

لەگەڵ پێشکەوتن و جەنجاڵی تەکنەلۆجیا وئینتەرنێت ومۆبایلی زیرەك، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی تووشی فیتنە بوون و دینیان پشتگوێ خستوە و پشتیان لە بنچینە و ئەساسیاتی دینەکە کردوە!!

وەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموویێت: (فإنِّي لأَرَى الفِتَنَ تَقَعُ خِلالَ بُيُوتِكُمْ كَوَقْعِ القَطْرِ). واتا: فیتنە دەچێتە ناو ماڵەکانتان هەروەکوو جێی نمەی باران کە چۆن دەبارێت!!

هەربۆیە شێخ عبدالعزیز الطریفي الله ئازادی بکات دەفەرموێت: خراپترین و پیسترین سەردەم لە دونیا لەو کاتەوەی کە باوکە ئادەم (علیه السلام) هاتوەتە سەر زەوی هەتا ئێستا، دوو سەردەم بوە!!

یەکەمیان: سەردەمی پێغەمبەر لوط بوو کە قێزەوەنترین و پیسترین فاحیشەیان داهێنا ئەویش نێربازی بوو خواپەنامان بدات!!!

دووەمیشیان: ئەم سەردەمەی ئێستایە کە تێیدا دەژین چونکە هەرچی تاوان و سەرپێچی و پیسی قەومەکانی پێشوو هەیە هەمووی تێیدا کۆبوەتەوە!!

هەربۆیە بەباشمان زانی وەکوو بەرچاوڕوونیەك کورتەیەك لەو فیتنانە باس بکەین کە بەسەر ئوممەتی ئیسلامدا دێت لە ئاخری زەماندا، بێگومان لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرمودەی خۆشەویستمان (علیه الصلاة والسلام). داواکارم لە الله تعالی تەوفیقمان بداتێ و عیلم و بەصیرەی خۆیمان پێ عەطا بکات، کە بتوانین خزمەتێکی بچوك بکەین بەو دینە.

والحمد لله رب العالمين

وصلى الله تعالى على نبينا محمد وعلى ألە وصحبه وسلم .

کاوە أسعد حسن .

## جیهان بە گشتی و ئوممەتی ئیسلام بەتایبەتی

## لە خەوێکی قوڵ و گێژاودایە!!!

لەگەڵ زۆری شەهەوات و خۆشویستنی دونیا وزۆربوونی تاوان و سەرپێچیشدا، ئیسلام ئەوەندە فیرقە و تاقمی گومڕای لێ دروست بوە، ئەوەندە ئیمام و زانای گومڕاو سەرلێشێواوی بەردەرگای سوڵتانی لێ پەیدابوە کە حەق و باتڵیان بەجۆرێك تێکەڵ کردوە جیاکردنەوەی زۆر قورس و ئەستەم بوە بۆ موسوڵمانان بە گشتی وکەسی عەوام بەتایبەتی!

ئەوەندە شوبوهاتیان دروست کردوە بۆ خەڵکی، ڕاست و ناڕاستیان هەموو تێکەڵ کردوە! کوفریان لە خەڵکی کردوە بە ئیمان و ئیمانیان کردوە بە کوفر!! مونافیق و دوو ڕوو هێندە باڵادەستن کە هەموو شوێنێکی ئەم سەر زەویەیان گرتوەتەوە، ئیسلامی ڕاست هەڵگری پەیامی الله و شوێنکەوتەی سوننەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، بەشێوازێك غەریب و نامۆ بوە، کە خەریکە هەڵگرانی دەبن بە تۆقێنەر

و تاوانبار وخراپترینی ناو کۆمەڵگا لە دیدی ئەهلی نیفاق !!!

هەربۆیە زۆرترین هەرە زۆری خەڵکی کەوتونەتە ناو گێژاو و زەلکاوێکەوە کە دەرچون لێی زۆر قورس و ئەستەمە !!

خەڵکی لە جیهان بەگشتی سەری لێشێواوە، لەگێژاودا دەژین وەکوو ئەوەی لە خەوێکی قووڵدابێت یانیش بە بەنجێکی بەهێز بەنج کرابێت !!

نازانن چی بکەن و چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ بارودۆخەکەدا بەهۆی سەختی و تاریکی و دژواری ئەو هەموو فیتنە و ئاشوب و زوڵم و ستەم و جەنگ و برسیەتی و ئەشکەنجە دەرونیانەی کە بەدەوریانەوەیە !!

هەموومان دەزانین کە ئەم قۆناغە قۆناغێکی سەخت و دژوارە، ئەوەی لە توانا و طاقەمان بوو سەرفمان کرد و تەواو بێ توانا بووین،

بەڕاستی خەڵکی تەواو هیلاك و ماندون بەهۆی ئەم هەموو ڕوداو و فیتنانەوە!!

ئەی دەبێت حاڵی خەڵکی چۆن بێت بۆ لەمەبەدوا کە فیتنە و ڕووداوەکان زۆر سەختتر و قورستر دەبن لە داهاتوودا والله اعلم ؟؟؟

هەروەکوو پێغەمبەریشمان (علیه الصلاة والسلام) فەرمویەتی: (لا يأتي عام إلا والذي بعده شر منه حتى تلقوا ربكم)[1]..

واتا: هیچ ساڵێك نایەت ئیللان ئەوەی دوای خۆی خراپتر دەبێت هەتا دەگەن بە خوای خۆتان.

تاکە چارەسەریش بۆ ئەم دۆخە و دەرچون لەم گێژاو وفیتنانە وکۆتایی هاتن بەم سەرلێشێواویە، گەڕانەوەیە بۆ بەرنامە ڕاستەکەی ئیسلام!!

[1] - البخاري

دڵنیاش بن ئیسلام هەر دەگەڕێتەوە گەر من و تۆ لەگەڵی بین یان نا!

چونكە ئیسلام نوری الله تعالی یە! تیشكی ئەو نورەش بەهێز و قوەتێكی زۆر گەورەوە سەرهەڵدەدات و خەڵكی لە تاریكیەوە بەرەو ڕووناكی بانگ دەكات و دەیانگەڕێنێتەوە بۆ سەر ڕێگا ڕاستەكە وعەدالەتی ئیلاهی بە ئیزنی الله، ئەو كات خەڵكی بۆیان ڕوون دەبێتەوە كە ئەو هەموو كات و ساڵانە كەچۆن خەڵەتێنرابوون بە فێڵ و پلانەكانی دەجاڵ و ئیبلیسی مەلعون و شوێنكەوتەكانیان لە ئینس و جن .

هەروەكوو پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێت: (سيأتِي على الناسِ سنواتٌ خدّاعاتٌ؛ يُصدَّقُ فيها الكاذِبُ، ويُكذَّبُ فيها الصادِقُ، ويُؤتَمَنُ فيها الخائِنُ، ويخَوَّنُ فيها الأمينُ، وينطِقُ فيها الرُّوَيبِضَةُ. قِيلَ: وما الرُّوَيبِضةُ؟ قال: الرجُلُ التّافِهُ يتَكلَّمُ في أمرِ العامةِ).

واتا: (ساڵانێکی هەڵخەڵەتێنەر بەسەر خەڵکیدا دێت، بڕوا بە درۆزن دەکرێت، ڕاستگۆ بە درۆزن دادەنرێت، خاین و خۆفرۆش بە دەستپاك دادەنرێت، دەستپاکیش بە خاین لە قەڵەم دەدرێت، (روەیبیضە) قسەی تیا دەکات، وتیان روەیبیضە چیە؟ فەرمووی: بێنرخترینی خەڵکی دەبێت بە دەم سپیان).

بۆیە ئەی ئەوانەی کە هەڵخەڵەتێنراون و بڕواتان بە وەعد و بەڵێنەکانی شەیتان و دەججالی درۆزن و شوێنکەوتەکانیان هێناوە!! ئەوە ئێمە بڕوامان بە وەعد و پەیمانی الله تعالی هەیە و دڵنیاشین هەر دێتە دی و سەرکەوتن و بردنەوەش هەر بۆ ئەولیاکانی الله یە .

ولاغالب الا الله .



## لە ئێستادا فیتنەی الدهیماء (جیاکردنەوەی ئیمان لە کوفرو نیفاق) گەیشتۆتە لوتکە!!

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە فەرموودەیەك کە ئەبو داود ڕیوایەتی کردوە و ئیمامی أحمد لە موسنەد هێناویەتی، وە ئەلبانیش بە صەحیح دایناوە .

باس لە فیتنەکانی ئاخری زەمان دەکات، ناوی سێ فیتنە دەبات یەکەمیان فیتنەی ئەحلاس (الأحلاس)، پاشان فیتنەی سەڕڕاء (السراء)، دواتریشیان فیتنەی (الدهیماء)،

بەپێی دیراسەکردنی فیتنەکان هەردو فیتنەی ئەحلاس و سەڕاء ڕویانداوە و کۆتایی پێ هاتوە!!

بەڵام ئەوەی کە ماوەتەوە فیتنەی دوهەیمائە!!

ئەم فیتنەیە هەروەکوو لە فەرموودەکەدا هاتوە، هەموو کەسێك ڕادەچڵەکێنێ لەم ئوممەتە !!!

مەرج نیە مرۆڤ بەشدار بێت لە نێو فیتنەکان، بەڵکو کاریگەری دەخاتە سەری، ڕایدەچڵەکێنێ

یانیش بەواتایەکی دیکە هەموو کەسێك ئەگەر بەدڵیش بێت پشتگیری لە لایەنێك دەکات و دژایەتی لایەنێکی دیکە دەکات !!!

هەرکاتێکش بڵێن کۆتایی هات لە لایەکی دیکەوە دەست پێ دەکاتەوە!!! واتا کاتێکی زۆر دەخایەنێت (لەوانەیە چەندین ساڵ بخایەنێت) هەربۆیە پیاو بەیانی لەخەو هەڵدەستێت موسوڵمانە هەتا دەگاتە ئێوارە ئیمانی لەدەست دەدات و کافر دەبێت!!! بە پێچەوانەشەوە شەو موسوڵمان بوە، بەیانی هەڵدەستێت ئیمانی لەدەست دەدات و کافر دەبێت!!!

واتا: کەسەکە خۆی یەکلایی دەکاتەوە بە پشتگیری کردنی لایەنێکی کافر وستەم کار!! ئیتر بە هەڵگرتنی چەك بێت بۆ ئەو لایەنە یان بەهەر شێوەیەکی دیکە بێت!!

هەتا وای لێ دێت خەڵکي بەگشتی دەبن بە دوو بەرەو تاقمەوە!! بەرەیەکیان ئیمانداری تەواون و هیچ نیفاقێك لەدڵیاندا نیە، بەرەیەکیشیان مونافیقی تەواون و هیچ ئیمانێك لەدڵیاندا نەماوە !!! (مەبەست لە دوو تاقم تەنها ئەوە نیە بەرامبەر یەکتری وەستابن بەچەکەوە، بەڵکو هەموو ئەوەی بەدڵیش خۆیان یەکلایی کردوەتەوە یان لەگەڵ بەرەی کوفرن یان لەگەڵ بەرەی ئیمان)

کاتێکیش بارودۆخ و حاڵی ئوممەت گەیشت بەو قۆناغە، ئیتر ڕوداوەکان بەرەو کۆتایی دەڕۆن دەبێت چاوەڕوانی دەجال بەشەخسی بکەین لە ئان و ساتدا!! ئەگینا بەرنامە و پرۆگرامەکەی لە مێژا کاری خۆی دەکات و ساڵانێکی زۆرە لەناومان دایە!!!

هەربۆیە ئەو ڕووداوانەی کە لەمڕۆدا دەبینرێن و تێیدا دەژین، وە ئەوەشی کە لەم ساڵانەی پێشودا تێیدا ژیاین، (وەکوو داگیرکردنی عیراق، و جەنگی فەللوجە، و پەلکێشکردنی شیعە و ڕافیزە بۆ عیڕاق لوبنان و سوریا و یەمەن و بەهاری بەناو عەرەبی، و فیتنەی سوریا و شام، و دروست بوونی میلیشیاکانی وەکوو حیزب الله ی لوبنانی، یەپەگە و پەکەکە و یەپەژە، و لەدایك بوونی دەوڵەتی ئیسلامی(داعش)، و جەنگی عەفرین و ڕەققە و کۆبانێ و موسڵ و فیتنەی یەمەن).

هەروەها ئەو ڕووداوانەشی کە لە داهاتویەکی نزیکدا ڕوودەدەن هەمووی لەسەر ئەو ڕێچکەیە دەڕۆن کە جیاکردنەوەی ئیمانە لە نیفاق و دووڕوویی!! خەڵکی بەڕێوەیە بۆ ئەو جیاکاریە کە دەبنە ئیمانداریکی پاك بێ هیچ نیفاقێك، وە نیفاقێکی تەواو بێ هیچ ئیمانێك!! ئەوەش بێگومان لە ڕووداوەکانی کۆتایی ئاخری زەمانە!!!

بۆیە ئەگەر کەمێك بەسیرەمان هەبێت و بەچاوێکی ئاسایی سەیری ئەو فیتنە و ڕووداوانەی ئێستا بکەین، پێویستمان بە کاتێکی زۆر و بیرکردنەوەیەکی قووڵ نیە بۆ جیاکردنەوەی حەق و شوێنکەوتەکانی لە باتڵ و شوێنکەوتەکانی!!

سەرەڕای ئەوەش مونافیق و دووڕوەکان دەبینرێن هەر چەپڵە لێ دەدەن یان کەسانێکی هەڵخەڵەتێنراو کە تووشی فیتنەکە بوونە لەو گێژاوەدا دەژین و ڕاستیەکە نابینن وەکوو بڵێی بێهۆش کراون!!

چونکە لە ئێستادا ئێمە لە قۆناغ وچەرخی دابەشبوونی ئیلاهیداین لەنێوان ئیماندارێکی ڕاستگۆ لەگەڵ ئیمانەکەی، و مونافیقێکیش کە ئیسلام دەردەخات بەڵام لەناخدا پێچەوانەی ئەوەیە !!

فاللهم اجعلنا من أهل الحق والإيمان .

## بەهەلاك چونی عەرەب پێش دەرکەوتنی مەهدی !!!

لەم قۆناغەی ئێستادا هەتا دەگەینە فیتنەی دەرکەوتنی دەجال (بەشەخسی خۆی)، هەموو جەنگ و فیتنەکان کە ڕوودەدەن بەبێ جیاوازی، جیاکردنەوەی حەق لە باطلە، لەبێژنگدانی پاك لە پیس و ئیماندار لە مونافیقە!!! خەڵکی هەمووی دەکات بە دوو بەرەوە، هەروەکوو لە فەرمودەکەی بەشی پێشو باس کراوە، یان ئیماندارێکی باش، یانیش مونافیقێکی خەبیس!!

دەبێت ئەوەشمان بیر نەچێت بەپێی فەرمودەکانی پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) ساحە و گۆڕەپانی ئەو هەموو جەنگو فیتنانە، ناوچەی ووڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە!!! بەتایبەتیش ناوچەی شام! کە لەئێستادا وڵاتانی (سوریا، ئەردەن، فەلەستین، لوبنان، بەشێکیش لە عیراق) دەگرێتەوە هەروەها لە داهاتوودا ووڵاتانی کەنداوی عەرەبیش دەگرێتەوە !!!

هەروەها ئەوەش بزانین کە هەموو کونج و کۆڵان وماڵێك دەگرێتەوە بەتایبەتی لە عەرەب، هیچ جێگە وشوێنێك نامێنێت فیتنەی تێ نەکەوێت!! هیچ کەسێك نامێنێت بەرینەکەوێت!!!

لە ساڵانی ڕابردوش زۆرێك لەو فیتنانەمان بە چاوی سەرمان بینی کە چۆن خەڵکی کرد بە دوو بەرەوە!!!

(مەبەستمان لە دوو بەرە ئەوەیە، یان ئیماندارێك کە دەستی بە ئیمانەکەیەوە گرت و نەیدۆڕان، یانیش مورتەددێکی مونافیق کە ئیمانەکەی لە دەست داو دۆڕاندی)!

نموونەشمان زۆر زۆرە لەو فیتنانەی کە خەڵکی کرد بە دوو بەرەوە لەوانە:

- دروست بوونی ئەو هەموو حیزبە عەلمانی و دژە دینە.
- داگیرکردنی عیراق.
- فیتنەی شۆڕشی بەناو عەرەبی وکەوتنی چەندین سەرکردەی وولاّتان.
- بلاّوکردنەوەی فەساد وبەدڕەوشتی لە سعودیە بەناوی کرانەوە و ڕابواردن(تەرفیە) .
- جەنگی غەززە و لەئێستاشدا جەنگی لوبنان.

لە داهاتوشدا ئەو جەنگانە زیاتر وزیاتر چرو فراوان دەبنەوە هەتا دەگاتە وولاّتانی سوریا و عیراق و ئەردەن و سعودیەش دەگرێتەوە والله أعلم، بەمەش عەرەب و قەومەکانی تری ناوچەکە تووشی هەلاکەتێکی زۆر دەبن وزۆربەیان لەناودەچن و ئاوارە و دەربەدەر دەبن هەروەکوو ئەوەی لە چەند فەرمودەیەك هاتوە!!

لەوانە :

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يبايع لرجل بين الركن والمقام، ولن يستحل البيت إلا أهله، فإذا استحلوه، فلا تسل عن هلكة العرب)[1]

واتا: بەیعەت بە پیاوێك دەدرێت لەناو حەرەمی مەككە(كعبة) لەنێوان ڕوكنی یەمانی ومەقامی ئیبراهیم، بەڵام شەڕ و ئاژاوەیەكی گەورەی لێ دەكەوێتەوە و كوشتارێكی زۆر دەكرێت، لەدوای ئەوە ئیتر لە هەلاكەت و لەناوچونی عەرەب مەپرسە (واتا عەرەب زۆر بەهەلاكەت دەچن)،

ئەم بەیعەتەش والله أعلم كاتی خۆی لە ساڵی ١٩٧٩ ڕووی دا كە بە ڕووداوەكەی جوهەیمان ناسراوە!!!

[1] - رواه احمد

ئەوەی دیارو ئاشکرایە هەر لە هەمان ساڵی١٩٧٩دا شۆڕشی ئێرانیان دروست کرد و خومەینیان بە تەیارەیەکەوە لە فەڕەنساوە هێنایەوە ئێران!!

بێگومان مەبەستیشیان هەبوو لەم شۆڕشە، بۆ جێبەجێ کردن و داڕشتنی پلانەکانیان لە داهاتوودا لە ناوچەکەدا.

وەك دەبینن لە دروستبوونی ئەم دەوڵەتی ئێرانە تا ئەم ساتەش هەڵگیرسێنەری هەموو جەنگ و فیتنەکانە و دەجالیش هەر لەوێوە دەردەکەوێت!

بۆیە دەبینین ئەو زەرەرەی کە کۆماری بەناو ئیسلامی ئێران لە ئیسلام و ئەهلی سوننەیان داوە هیچ دوژمنێك ئەوەی نەکردوە!

ئیتر لەوە بەدواوە تا ئێستاش عەرەبەکان بەبەردەوامی دەچەوسێنرێنەوە!

دیارە چیان بەسەر هاتووە چۆن بەهەلاكەت چوونە وەك ئەوەی لە فەرمودەكەدا ئاماژەی پێكراوە،

بەڵام هەمیشە لەبیرمان بێت هەرچی ڕوودەدا لەناو ئەم ئوممەتە هەمووی تاقیكردنەوەی الله تعالی یە، لەهەمان كاتیشدا جیاكردنەوەی حەق لە باطلە .

والله غالب علی أمره .



## فیتنەی هەرج و کوشتن لەناو ئوممەتی ئیسلام جۆرێکی ترە لە فیتنەی دوهەیماء کە بەرۆکی ئەم ئوممەتە دەگرێت!!!

هەروەك لەبەشی پێشوودا باسمان لە تیاچون و بەهیلاك چونی عەرەب کرد کە چۆن بەجۆرەها پلانی شەیتانی و دەججالی تووشی چەندەها جەنگ وفیتنەیان دەکەن !!!

بێگومان ئەم هەموو فیتنە و ئاشوبانە کە بەرۆکیان دەگرێت، لە دوای ئەوە دێت، کە خەڵکی ئەو وڵاتانەیان تووشی جۆرەها کوفر وشیرك وگومڕایی کردوە بەناوی دیموکڕاسیەت و عەلمانیەت و ئازادی و مافی مرۆڤ و مافی ژن و کۆمەڵێك قسەی باق وبریق!!!!

بەجۆرێك وایان لە خەڵکی وڵاتانی شەرق کردوە بەتایبەتیش عەرەب، کە دەستبەرداری حوکم و شەرعی الله بن، وە پشت لە دین

وبەرنامەی الله تعالى بکەن، بەو هۆیەوە ئەم سیستەمە شەیتانی و دەججالیە گەورەترین ئامانجی خۆیان پێکا و ئەوەی کە دەیانویست بەدەستیان هێنا!!

تا لەکۆتاییدا بەهۆی ئەو جەهل و نەزانین و بێ ئاگاییە لە دین و شەرعی الله تعالى بوە هۆکاری دروست بوونی جۆرەها تاقم وحیزب و کۆمەڵ و جەماعەت و ڕێکخراو بەناوی ئیسلام و غەیری ئیسلامیش!! کە هەمووی دژ بە یەکن و لەهەمان کاتیشدا دژی بەرنامە ڕاستەکەی الله تعالى ن !!

کە بەروبومەکەشی بوە تەفرەقەو ئیختیلاف وجیاوازی و ناکۆکی، تاوای لێ هات زۆرینەی خەڵکی کرد بە دوژمنی یەکتری، کاتێکیش فیتنەیەك سەرهەڵدەدات، هەموو دەست دەکەن بە یەکتر کوشتن وکوشت و کوشتاری یەکتری، بەبێ هۆکارو لەناو گێژاوی فیتنەیەکی تاریك و لێڵدا!!

نموونەی ئەو فیتنە تاریکەش بەچاوی خۆمان بینی هەر لە کوردستان لە نێوان یەکێتی و پارتی و حیزبەکانی دیکە بەهەزاران کەس کوژران، پاشان عیراق لەنێوان شیعە و سوننە، دواتریش بۆ وولاتانی دیکەی وەکوو سوریا و لیبیا و یەمەن و لوبنان و چەندین تر! کە برا برای دەکوشت! باوك کوڕی دەکوشت! ئامۆزای یەکتریان دەکوشت! ئەم فیتنەیەش پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە دەقی فەرموودەی صەحیح باسی کردوە بۆمان! وەکو دەفەرموویت: (عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه قال:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُنَا أَنَّ بَيْنَ يَدَيْ السَّاعَةِ الْهَرْجَ . قِيلَ : وَمَا الْهَرْجُ ؟ قَالَ: الْكَذِبُ وَالْقَتْلُ . قَالُوا : أَكْثَرَ مِمَّا نَقْتُلُ الْآنَ ؟ قَالَ : إِنَّهُ لَيْسَ بِقَتْلِكُمْ الْكُفَّارَ، وَلَكِنَّهُ قَتْلُ بَعْضِكُمْ بَعْضًا، حَتَّى يَقْتُلَ الرَّجُلُ جَارَهُ، وَيَقْتُلَ أَخَاهُ، وَيَقْتُلَ عَمَّهُ ، وَيَقْتُلَ ابْنَ عَمِّهِ . قَالُوا : سُبْحَانَ اللَّهِ! وَمَعَنَا عُقُولُنَا؟ قَالَ: لَا، إِلَّا أَنَّهُ يَنْزِعُ عُقُولَ أَهْلِ ذَاكَ الزَّمَانِ، حَتَّى يَحْسَبَ أَحَدُكُمْ أَنَّهُ

عَلَى شَيْءٍ وَلَيْسَ عَلَى شَيْءٍ).

واتا: ئەبو موسای ئەشعەری الله لێی ڕازی بێت فەرموی: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەموویێت: لە سەروبەندی کۆتایی دونیا هەرج دەردەکەوێت. وتیان هەرج چیە؟ فەرمووی: کوشتن و درۆ!! وتیان: زیاتر لەوەی کە ئێستا دەکوژین؟ فەرمووی: ئەوە کافر کوشتن نیە. بەڵکو یەك یەکتر دەکوژن! هەتا وای لێ دێت پیاو براکەی خۆی دەکوژێت، یان مامی خۆی دەکوژێت، یان ئامۆزای خۆی دەکوژێت، وتیان: سبحان الله!!! باشە ئێمە لەو کاتەدا عەقڵ وبیر وهۆشمان هەیە؟ فەرمووی: نەخێر. بەڵکو عەقڵی خەڵکی ئەو سەردەمە تێك دەچێت، وادەزانن لەسەر حەقن و هیچیش نین.

یان لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموویێت: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ ، لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَأْتِيَ عَلَى النَّاسِ يَوْمٌ لَا يَدْرِي الْقَاتِلُ فِيمَ قَتَلَ ، وَلَا الْمَقْتُولُ فِيمَ قُتِلَ ، فَقِيلَ : كَيْفَ يَكُونُ ذَلِكَ ؟ قَالَ : الْهَرْجُ ، الْقَاتِلُ

وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ). واتا: بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە، دونیا کۆتایی نایەت هەتا ڕۆژێك دێت بکوژ نازانێت لەسەر چی دەکوژێت، و کوژراویش نازانێت بۆچی کوژراوە!! وتیان: چۆن شتی وا ڕوودەدات؟ فەرمووی: ئەوە هەرجە بکوژ و کوژراوە بۆ ناو دۆزەخە .

ئەم ڕووداو و جەنگ و فیتنانەش بەهەمان شێوە بەشێکن لە فیتنەی دوهەیماء کە جیاکردنەوە و تەمحیص و لەبێژنگدانی ئیماندارە لە مونافیق و دین فرۆش گومڕاکان! هەتا دێتیش فیتنەکان زۆرترو توندترو قورستر دەبن!! بەردەوامیش دەبێت هەتا دەگاتە وولاتی سعودیە و شەڕی سێ کوڕە پاشاکان و روخانی دەسەلاتی خۆسەپێن و دەرکەوتنی مەهدی و فیتنە و نیشانە گەورەکانی قیامەت!!

بۆیە با ووریای خۆمان بین و خۆمان نەخزێنینە ناو ئەو هەموو فیرقە و تاقمە گومڕاو سەرلێشێواوە تاکو نەکەوینە ناو ئەو فیتنە لێڵ و تاریکانەی کە بەڕوونی بەدەورمانەوەن .

## جیهان بە گشتی لە کۆتایی ڕێگاکەدایەو جەنگەکانیش تا دێت فراوانتر دەبێت !!!

جیهان بەگشتی لە کۆتایی ڕێگاکەدایەو، زەویش پڕبوە لە زوڵم و ستەم، ئیتر لەوە زیاتر هەڵناگرێت هەربۆیە دەبێت بەلایەکدا بکەوێت و کۆتایی پێ بێت!! لەلایەکەوە جەنگ و کوشتن و کاولکاری وولاتان و لەلایەکی دیکەش زوڵم و ستەم و برسیکردن و زیندانی کردنی موسوڵمانان و حەق بێژان،

هەموو ئەمانەش لەلایەن ئەو نوخبەیەوە دەکرێت کە حوکمی جیهان دەکەن لە پشتی پەردە وژووره تاریکەکانەوە!! ئەوانیش: (سیستەمی جیهانی نوێیە کە لەلایەن ماسۆنیەتی جیهانی و بەسەرکردایەتی ڕاستەوخۆی ئیبلیسی شەیتان و دەجالەوە بەڕێوە دەبرێت)!!

چونکە ئەم سیستەمە شەیتانیە بەردەوام لە پلان و داڕشتنی جەنگی کاولکارو وێرانکەردان! وەکوو ئەوەی کە ئێستا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕوسیا و ئۆکرانیا چەندین وولات و شوێنی دیکە دەگوزەرێت!! هیچ گرنگیش نیە بەلایانەوە خەڵکی دەکوژرێت، یان وولات کاول دەبێت، یان برسێتی بڵاو دەبێتەوە یان هەر نەهامەتیەکی دیکە کە بەسەر مرۆڤایەتیا دێنن، بەڵکو ئەوەی گرنگە لای ئەوان جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئیبلیس و دەججالە،

هەموو ئەو جەنگانەش کە پێشتر ڕویانداوە هەر دەستی ئەم سیستەمە بۆگەنەی تێدا بوە، ئاگرو بڵێسەکەی داگیرساندوە!!! وەکوو جەنگی جیهانی یەکەم و جەنگی جیهانی دوەم کە بەملیۆنەها خەڵکی تیا کوژرا!!!

ئێستاش لە ئامادەکاریەکی چڕو پڕدان بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی سێیەم!!

هەروەکوو بینیمان چۆن ڕوسیایان خزاندە ناو ئەو جەنگە کاولکارە و لەلایەکی دیکەشەوە ئیسڕائیل کە سەری هەموو فیتنەکانە، کارە گەورەکەیان بۆ تەواو دەکات، لە پێشدا فەلەستین وغەززەیان کاول کرد، ئێستاش ئاگری جەنگەکە گەیشتە لوبنان و لەدوای لوبنانیش سوریا و عیڕاق دەگرێتەوە والله اعلم!!!

بەڵام ئەوەمان بیبر نەچیت کە هەرچەندە پلان و داڕشتن بکەن بۆ کاولکاری و جەنگ، پلانی الله تعالی زۆر بەهێزترو کاریگەرترە لەوەی پلانی ئەوان!!!

لەبەر ئەم هۆکارانە

یەکەم: وڵاتانی ئیقلیمی ناوچەکە تەنها وەکوو سەیرکەر نامێننەوە! بەڵکو ئەوانیش پریشکی جەنگ دەیانگرێتەوە، بەتایبەتیش سعودیە کە لە چەندین فەرمودە هاتوە دەبێت بە بەشێك لەو جەنگە، وە هەر لەوێشەوە سەرکردەی ئیسلام وموسوڵمانان دەردەکەوێت (ئیمامی مەهدی)، کە سەرەتای سەرکەوتن وگەڕانەوەی عیززەت و شکۆی موسوڵمانان.

دووەم: بێگومان ڕوسیاش ناوەستێ لەسەر ستەیج و سەیری کۆتایی خۆی بکات!! بەڵکو ئەویش هەرچی چەك و ئەتۆمی هەیە لە جبەخانەکان بەتاڵی دەکاتەوە بۆ بەرەنگاربونەوەی دوژمنەکانی و چەندین وڵاتی زلهێزیش دەخزێنە ناو جەنگەکەوە!!!

ئەم جەنگ و کاولکاریەش لە فەرموودەی پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) هاتوە بەناوی (الملحمة الکبری)، هەروەها لە دینی نەسڕانیشدا باس کراوە و بڕوایان پێیەتی و بەناوی (ئەرمەجدۆن)، وە

لە تەوراتی جولەكەشدا بە جەنگی (يأجوج و مأجوج) هاتوە!!!

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە فەرموودەیەكی صەحیحدا كە ئەبو داود ڕیوایەتی كردوە دەفەرمووێت: (سَتُصالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا ، فَتَغْزُونَ أنْتُمْ وهُمْ عَدُوًّا من ورائِهِمْ، فَتَسْلَمُونَ وتَغْنَمُونَ، ثُمَّ تَنْزِلونَ بِمَرْجٍ ذِي تُلولٍ فَيَقُومُ رجلٌ مِنَ الرومِ فيَرْفَعُ الصَّلِيبَ، ويقولُ: غَلَبَ الصَّلِيبُ ! فَيَقُومُ إليهِ رجلٌ مِنَ المسلمينَ فَيَقْتُلُهُ فيغدرُ القومُ وتَكُونُ المَلاحِمُ فَيَجْتَمِعُونَ لَكُمْ فيأتونَكُمْ في ثَمانِينَ غَايَةً مع كلِّ غَايَةٍ عشرَةُ آلافٍ).

هەروەها لە فەرمودەیەكی تر كە ئیمامی احمد و حاكم ڕیوایەتیان كردوە بە صەحیحی دەفەرمووێت: (وَهُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ، يَأْتُونَكُمْ عَلَى ثَمَانِينَ غَايَةٍ، كُلُّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا، ثُمَّ يَغْدِرُونَ بِكُمْ، حَتَّى حَمْلِ امْرَأَةٍ).

هەروەها ئیمامی بوخاریش دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ، فَيَغْدِرُونَ فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً، تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا).

بەکورتی وپوختی فەرمودەکان باس لە ڕێکەوتن و هودنە دەکەن لەگەڵ ڕۆم!! هودنە(بەواتای ڕاگرتنی جەنگ دێت بۆ ماوەیەکی کاتی)، هەروەها زانایان لەسەر ئەوە یەک دەنگن کە ئەم هودنە و جەنگە گەورەیەی کە لە فەرمودەکاندا باس کراوە لە ئاخری زەمان ڕوودەدەن!

کەوایە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هۆشداری داوە پێمان کە لە کۆتایی زەمان، جیهان جەنگێکی کاولکار دەیگرێتەوە بێگومان موسوڵمانانیش بەشێکن لەو جەنگە، بەڵام بۆماوەیەکی کاتی موسوڵمانان لەگەڵ (ڕۆم) ڕێکەوتن و گرێبەستێك دەکەن!! ڕێکەوتنەکەش ئەوەیە کە بۆماوەیەك جەنگ لەنێوانی خۆیان ڕادەگرن

و بە هەردولایانەوە لەگەڵ دوژمنێکی دیکە دەجەنگن!!!

مەعلومی هەموو لایەکە ئێستا جیهان دابەش بوە بەسەر دوو هێزو دوو بەرەدا بەرەیەکیان (ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و هاوپەیمانەکانیانە) بەرەکەی دیکەشیان (ڕوسیا و چین و ئێران و هاوپەیمانەکانیانە).

بەڵام ڕۆم هەتا ئێستا یەکلایی نەبوەتەوە ئایا ئەمریکاو ئەوروپای ڕۆژئاوایە؟؟ یان ڕوسیاو ئەوروپای ڕۆژهەڵاتە؟؟

(ڕۆم: لەبنچینەدا بەگشتی کەنیسەی ئەرسەدۆکسی یۆنانی دەگرێتەوە وبە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتە ناسراوە، خاکیکی فراوانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاو ئەنادۆڵ و ڕوسیاش دەگرێتەوە، بنکەی سەرەکی ئەم کەنیسەیە، واتا: ئیمپراتۆری ڕۆم لە یۆنان نیشتەجێ بوو، بەڵام دواتر بنکەی سەرەکیان گواستەوە بۆ قوستەنتینیە، (استانبوڵ)ی

ئێستا، پاشان دواى ئەوەى محمدى فاتح قوستەنتينيەى فەتح كرد و كەوتە سەر خاكى موسوڵمانان، بنكەى سەرەكيان گواستەوە بۆ مۆسكۆى پايتەختى ڕوسيا).

هەربۆيە بۆچونەكان زياتر بۆ ئەوە دەچن كە ڕوسيا ڕۆم بێت!! هەرچەندە زۆرێك لە زانايان پێيان وايە كە ئەمريكا و هاوپەيمانەكانى ڕۆم بێت!! بەڵام دواتر هەموو شتێك ئاشكرا دەبێت.

هەروەكو لاى هەموان ئاشكرايە كە جەنگى نێوان ئەو دوو هێزە گەورەيەى جيهان چەند ساڵێكە بە كردار دەستى پێ كردوە (ڕوسيا و ئۆكڕانيا) ئێستاش پێى خستوەتە ناو قۆناغێكى زۆر مەترسيدار، تەنها ئەوە ماوەتەوە ئەو هاوپەيمانيە دروست ببێت لەگەڵ موسوڵمانان!!!

لەکۆتاییشدا موسوڵمانان لەگەڵ ڕۆم ئەو هاوپەیمانی و هودنەیە دەکەن وە لەگەڵیاندا جەنگێکی گەورە دەکەن لەگەڵ دوژمنی هەردولایان!!

(ئیتر یان لەگەڵ ڕوسیا هاوپەیمانی دەبەستن و ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیان لەناو دەبەن یانیش لەگەڵ ئەمریکا هاوپەیمانی دەکەن و ڕوسیا و هاوپەیمانەکانیان لەناو دەبەن)) والله اعلم بالصواب



# شکاندنی هودنە و هاوپەیمانی ڕۆمەکان و دەرکەوتنی ئاڵا ڕەشەکان

لەبەشی پێشوو باسمان لە هودنەو هاوپەیمانێتی موسوڵمانان کرد لەگەڵ ڕۆم، بێگومان بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەڵام ئەم هاوپەیمانی و هودنەیە کاتێکی زۆر ناخایەنێت و کۆتایی پێ دێت و جەنگە گەورەکە دەست پێ دەکات کە بە (الملحمة الکبری) ناوی هاتوە!!!

بەگوێرەی فەرمودەکە نێوانی شکاندنی هودنەکە و جەنگە گەورەکە تەنها نۆ مانگە!! هەروەکو ئیمامی احمد و حاکم ڕیوایەتیان کردوە بە صەحیحی لە پێغەمبەری خواوە (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (وَهُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَينَ بَنِي الأَصْفَرِ، يَأْتُونَكُمْ عَلَى ثَمَانِينَ غَايَةٍ، كُلُّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا، ثُمَّ يَغْدِرُونَ بِكُمْ، حَتَّى حَمْلِ امْرَأَةٍ)

واتا: هودنەكەی نێوانی ئێوە و ڕۆم كۆتایی پێ دێت و پاشان سوپا وهێزێكی زەبەلاح لەژێر هەشتا ئاڵاوە،(واتا هەشتا ووڵات بەشدارە تێیدا) بۆتان دێن، كە هەر ئاڵایەك(١٢٠٠٠) دوازدە هەزار چەكداریان لەگەڵدایە!! نێوانی كۆتایی هودنەكەو هاتنی ئەو هێزەش تەنها نۆ مانگە!! هەروەكو لە فەرمودەكە دەفەرموێت: بەهێندەی ماوەی دووگیان بوونی ئافرەتێك!!

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا كێن ئەوانەی لەموسوڵمانان هودنە دەكەن لەگەڵ ڕۆم؟؟

چونكە مەعلومی هەموو لایەكە ئەم سەركردانەی ئێستای ووڵاتە موسوڵمان نشینەكان هیچیان لەسەر ڕێبازو ڕێچكەی ئیسلامە ڕاستەقینەكە نین!! بگرە زۆربەشیان دوژمنی ئیسلامن!! بەڵام ووڵاتەكان ووڵاتی ئیسلام وموسوڵمان نشینن،

ئەوەی دیارە لەم کاتەدا معەسکەری شەرق کە ڕوسیایە نزیکترە لە موسوڵمانانەوە ئەگەرچی لە جەنگی سوریا ڕێژەیەکی زۆر لە موسوڵمانیان کوشت!! بەڵام ئێستا بارودۆخەکە جیاوازە، چونکە حاڵی حازر ڕوسیا خۆی بەشێکە لەو جەنگە، ئێستا ڕوسیا لەگەڵ چیچان پێکەوە دەجەنگن بەرامبەر ئۆکرانیا!! هەروەها هاوپەیمانی تەواوی هەیە لەگەڵ کۆمەڵێك وڵاتانی موسوڵمان نشینی ناوچەکەی وەکو: (ئێران، پاکستان، ترکمانستان، تاجیکستان، کازاخستان، قیرغستان) وەهەروەها لەگەڵ ئەفغانستانیش دۆستایەکی باشیان هەیە!!

لەگەڵ تورکیاش زۆر نزیکن لەوەی کە ببنە هاوپەیمانی یەکتر! لە وڵاتە عەرەبیەکانیش لەگەڵ عیراق و سوریا بە ئاشکرا هاوپەیمانن

بەڵام هەرچی ئەمریکاو ئیسرائیلە، هاوپەیمانی لەگەڵ وڵاتانی خەلیج و میسرِ هەیە لە وڵاتە موسوڵمان نشینەکان!

لەم کاتەشدا کە دەبینن ئیسڕائیل بە یارمەتی ڕاستەوخۆی ئەمریکا قەتڵوعامی خەڵکی غەززەی کردوە! پڕیشکی جەنگەکەش گوازرایەوە بۆ لوبنان و خەریکە وڵاتانی دیکەی ناوچەکەش دەگرێتەوە وەکو عیڕاق و سوریا!!

هەربۆیە وڵاتانی خەلیجیش بەتایبەتی سعودیە زۆر پڕن لە ئیسرائیل و ئەمریکا، دوور نیە وزۆریش نزیکە والله اعلم، کە ئەوانیش بادەنەوە بۆلای ڕوسیاو واز لە ئەمریکا بهێنن!! بۆیە هەموو ئەم وڵاتە ئیسلامیانە هاوپەیمانی لەگەڵ ڕوسیا دەکەن وجەنگێکی خوێناوی وکاولکار دەکەن لەگەڵ ئیسڕائیل وئەمریکا وبەشێکیش لە ئەوروپا! لەم جەنگەشدا چەکی زۆر قورس بەکاردێت وەکو ئەتۆم و موگناتیزی والله اعلم !!!

جەنگەکەش بە سەرکەوتنی موسوڵمانان و روسیا و هاوپەیمانەکانی و شکاندنی ئیسڕائیل و ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی کۆتایی دێت !!

لەم سەروبەندەشدا کە دونیا پڕ بوە لە جەنگ وکوشتار، موسوڵمانانی بۆخواسوڵحاو و ستەم لێکراو ئاهێك بەبەریاندا دێتەوە، ئەو خەلافەتەش کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئاماژەی پێکردوە بە ئاڵا ڕەشەکان، جارێکی دیکە دروست دەبێتەوە!! و ئیعلانی سەرکەوتنی ئیسلام دەکەن بەسەر خاچ پەرستان!! بەڵام ڕۆمەکان ئەمەیان پێ قبوڵ ناکرێت وهودنە وهاوپەیمانێتیەکە هەڵدەوەشێننەوە و جەنگ و کوشتاری موسوڵمانان دەکەن!!

ئەوەشمان بیبر نەچیت، هەروەکوو چۆن پێشتریش لەهەموو سەردەم و زەمانێکدا هەوڵی گەڕانەوەی خەلافەت وحوکم و شەرعی الله تعالی دراوە وزۆرینەی خەڵکە بەناو موسوڵمانەکە ڕەتیان کردوەتەوە ودژی وەستاونەتەوە و قبوڵیان نەکردوە!!

بەهەمان شێوە ئاڵا ڕەشەکانیش کە دەردەکەون و دێن، لەلایەن زۆرینە قبوڵ ناکرێن و ڕەت دەکرێنەوە، الا من رحم الله کەسێك الله تعالی ئیخلاس و بەرچاوڕوونی پێ دابێت!!

بێگومان بەپێی فەرمودەکان ئاڵا ڕەشەکان لە خوڕاسانەوە سەرهەڵدەدەن وسەرکەوتن بەدەست دەهێنن!! بۆچونەکانیش بۆ ئەوە دەچن کە وولاتی ئەفغانستان بەتەواوی دەکەوێتە ژێر دەستیان ولەوێوە دێن حوکمی ڕافیزە و شیعە گەرایی لە ئێران و عیراق و سوریا ڕادەماڵن وتەواوی دەکەن،

هەروەها کۆتایی بە حوکمی جەبری دەهێنن لە وولاتانی ناوچەکە هەربۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لەبارەیانەوە دەفەرموویێت: (فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قوم). واتا: بەشێوەیەك کوشتارتان دەکەن کە پێشتر هیچ قەومیك بەو شێوەیە کوشتاریان نەکردون !!!

بێگومان ئەمە لەکاتێکیشدایە لە سعودیە شۆڕشێکی گەورە بەرپابوە، بشێویەکی زۆر دروست بوە و ئیمامی مەهدیش دەرکەوتوە!!

هەروەکو پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموویێت:

(يَقْتَتِلُ عِنْدَ كَنْزِكُمْ ثَلَاثَةٌ ، كُلُّهُمْ ابْنُ خَلِيفَةٍ، ثُمَّ لَا يَصِيرُ إِلَى وَاحِدٍ مِنْهُمْ، ثُمَّ تَطْلُعُ الرَّايَاتُ السُّودُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قَوْمٌ، ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا لَا أَحْفَظُهُ! فَقَالَ: فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الثَّلْجِ ، فَإِنَّهُ خَلِيفَةُ اللَّهِ الْمَهْدِيُّ) .

واتا: سێ کەس جەنگ وکوشتارێك هەڵدەگیرسێنن لەلای خەزێنەکەتان، (خەزێنە واتا: کەنز، مەبەستیش لێی کەنز و خەزێنەی کەعبەیە)، ئەوانەی جەنگەکە هەڵدەگیرسێنن هەرسێکیان کوڕە خەلیفە یان پاشان!! دواتر ئەو کەنز و خەزێنەیە بۆ هیچیان نابێت! پاشان ئاڵا ڕەشەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەون، کوشتارێکتان لەگەڵدا دەکەن کە هیچ کەسێك بەو جۆرە نەیکردوە، دواتر پێغەمبەر

(علیه الصلاة والسلام) شتێکی فەرموو کە لێی تێنەگەیشتن!! ئەوجا فەرمووی: ئەگەر بینیتان بەیعەتی پێ بدەن ئەگەر بەسکە خشکێش بێت لەسەر بەفر، چونکە ئەوە خەلیفەی الله یە لەسەر زەوی ئەو مەهدیە) .

فەرموودەکەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە لەگەڵ ئاڵا ڕەشەکاندا ئەو سەرکردەیەش دەردەکەوێت کە ڕزگاری ئوممەتی لەسەر دەست دێتە جێبەجێ کردن کە ئەویش بە (مەهدی) ناسراوە .



# دەرکەوتنی مەهدی و کۆتایی هاتنی حوکمی تاغوتی بنەماڵەی آل سعود

لە بەشی پێشوو باسمان لەو جەنگ و شەڕە کرد کە ڕۆم بە هاوپەیمانی موسوڵمانان دەیکەن لەگەڵ دوژمنی بەرامبەریان، پاشان شکاندنی هودنە وهاوپەیمانێتیەکە لەلایەن ڕۆمەوە و دەرکەوتنی ئاڵآ ڕەشەکان لە خوڕاسانەوەو هاتنیان بەرەو عیڕاق وشام،

بێگومان لەو کاتەدا وولاتانی ناوچەکە (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) پشێوی و ئاژاوەیەکی زۆری بەخۆیەوە بینیوە!! چونکە پێشترو بەماوەیەکی زۆرە تووشی جەنگ و کوشتارێکی سەخت ودژوار بوە، خەڵکێکی زۆرو بێشوماریان لێ کوژراوە، هەروەها ژێرخانی ئابووری ئەو وولاتانە بەتەواوی داڕوخاوە!!!

لەلایەکی دیکەشەوە لە سعودیە، پاشای ئەو کاتەی سەرتەخت دەمرێت و پشێویەکی زۆر لەناوخۆی وڵات و تەخت ودەسەڵاتەکەی دروست دەبێت لەنێوان سیان لە کوڕە پاشاکانی پێشو (سێ ئامۆزا)!! بەکورتی تووشی جەنگێکی ناوخۆیی دەبن و وڵات بە تەواوی لە کۆنترۆڵ دەردەچێت!! ئەو تەخت و دەسەڵاتەش بۆ هیچ کام لەو سێ کوڕە پاشایە نابێت!! لەم سەروبەندەشدا مەهدی دەردەکەوێت!!

هەروەکو دەفەرمووێت: (يَقْتَتِلُ عِنْدَ كَنْزِكُمْ ثَلَاثَةٌ ، كُلُّهُمْ ابْنُ خَلِيفَةٍ، ثُمَّ لَا يَصِيرُ إِلَى وَاحِدٍ مِنْهُمْ ، ثُمَّ تَطْلُعُ الرَّايَاتُ السُّودُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قَوْمٌ، ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا لَا أَحْفَظُهُ! فَقَالَ: فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الثَّلْجِ ، فَإِنَّهُ خَلِيفَةُ اللَّهِ الْمَهْدِيُّ).

واتا: لەسەر کورسی و تەخت و دەسەڵات سێ کەس کوشتار دەکەن، کە هەرسێکیان کوڕە پاشان، بەڵام ئەو تەخت و دەسەڵاتە بۆ

هیچ کامیان نابێت، دوابەدوای ئەوە ئاڵا ڕەشەکان دەردەکەون لە ڕۆژهەڵاتەوە (مەبەست لێی خوڕاسانە کە ئەفغانستان و بەشێك لە ئێرانی ئەمڕۆیە)، بەجۆرێك کوشتارتان دەکەن کە هیچ قەومێك بەو شێوەیەی لەگەڵدا نەکردون، دواتر شتێکی باس کرد، فەرمووی: ئەگەر بینیتان بەیعەتی پێ بدەن ئەگەر بەسکە خشکێ لەسەر بەفریش بێت خۆتانی بگەیەنن، چونکە ئەوە خەلیفەی الله یە مەهدیە .

بێگومان ئەو فەرموودانەی کە باس لە مەهدی دەکەن زۆرن، دەگاتە حەددی تەواتر، لەنێوان صەحیح و حسن وضەعیف دایە، کۆمەڵێك لەم فەرمودانە باس لە شکڵ و شێوەی دەکات، وە باس لەوە دەکات کە لە ئال و بەیتی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام)، باس لە ناوەکەی دەکات، هەروەها باس لە کات وسات وشوێنی دەرچونی دەکات وە باسی دادگەری و عەدالەتی دەکات.

لە یەکێك لە ڕیوایەتەکان پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کاتێك باسی شوێنی دەرچون وبەیعەتەکەی دەکات دەفەرمووێت: (لەناو حەڕەمی مەککە، لە نێوان مەقامی ئیبڕاهیم و ڕوکنی یەمانی بەیعەتی پیَ دەدرێت)!!

هەروەها دەفەرمووێت: (ئەو خۆی ڕازی نیە بەیعەتی پیَ بدرێت، خۆی دەشارێتەوە وخۆی ناناسێنێت، بەڵام لەو کاتەدا حەوت کەسی زانا دەیناسنەوە و بەزۆر بەیعەتی پیَ دەدرێت)!!

هەروەها دەفەرموێت: ((ناوی وەکوو ناوی من وایە و ناوی باوکیشی وەکو ناوی باوکی من وایە)) .

هەروەها دەفەرمووێت: (لەکاتێکدا دەردەکەوێت زەوی پڕ بوە لە زوڵم و ستەم و جەنگ وکوشتار، بەڵام ئەو پڕی دەکات لە عەدالەت و دادگەری)!!

هەروەها دەفەرموویێت: (حەوت ساڵ دەمێنێتەوە لەناو ئوممەت، لەو کاتەشدا عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام) دێتەوە دونیا و لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە لە مزگەوتی (المنارة البیضاء) لە کاتی نوێژی بەیانی مەهدی ئیمامەتەکە دەکات، عیساش (علیه الصلاة والسلام) لە دوایەوە نوێژ دەکات)! واتا: لە زەمانی هاتنی مەهدی نیشانە گەورەکانی قیامەتیش دەردەچن!! چونکە گەڕانەوەی عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام) لە نیشانە گەورەکانی قیامەتە !!

کاتێکیش بەیعەتی پێ دەدرێت پێش هەموو کارێك وولاتی سعودیە پاك دەکاتەوە لەو تاغوتانە، هەر کەسەرانی کوفر ئەم ڕووداوە دەبینن لە شامەوە سوپا وهێزێکی گەورەی بۆ دەنێرن، بۆ ئەوەی ئەو شۆڕش و جیهادەی بەرپای کردوە کۆتایی پێ بێنن!!

(چونکە ترسیان لێ دەنیشێت ودەزانن ئەمە ئیسلامە ڕاستەقینەکەیە)!!

ئەو سوپا و هێزە کوفریە کە بەڕێ دەکرێت، دێن هەتا دەگەنە شاری مەدینە و ئەو شارە پیرۆزە کاول دەکەن و دواتر بەڕێ دەکەون بەرەو شاری مەککە! بەڵام لەو نێوەندەدا الله تعالی بەناخی زەویان دەباتە خوارەوە هەمویان لەناو دەچن!!

هەروەکو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (عن أم سلمة قالت: قال صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَعوذُ عائِذٌ بِالبَيْتِ فَيُبْعَثُ إِلَيه بَعْثٌ، فإذا كانوا بِبَيْداءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِم. فَقُلتُ: يارسولَ اللّهِ فَكَيْفَ بِمَنْ كانَ كارِهاً؟ قالَ: يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُم، ولَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ القِيامَةِ على نيته).

واتا: ئوم سەلەمە الله لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (کەسێك لە ناو حەرەمی مەککە پەنا دەگرێت بە کەعبەوە و بەیعەتی پێ دەدرێت، پاشان سوپایەکی بۆ دەنێرن بۆ سەرکوت کردنی، بەڵام کاتێك ئەو سوپایە دەگەنە بیابان

لەویێ بەناخی زەویدا ڕۆدەچن، دەڵێ منیش وتم: یارەسول الله ئەی ئەگەر کەسێکیان بەزۆر هێنابێت؟ پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەواندا ڕۆ دەچێت بەناخی زەویدا، بەڵام لە ڕۆژی قیامەت لەسەر نیەتی خۆی زیندوو دەکرێتەوە و حیسابی لەگەڵ دەکرێت).

هەربۆیە ئەو سوپایەی کە لە نێوان مەککەو مەدینەدا بە ناخی زەویدا ڕۆدەچێت، باشترین بەڵگەیە بۆ ناسینەوە و دڵنیابوون لە مەهدی!! بێگومان لەو کاتەشدا جەنگە گەورەکە دەست پێ دەکات کە ناسراوە بە (الملحمة الكبرى) !!!



# جەنگە گەورەکە (الملحمة الكبرى) و سەرکەوتنی موسوڵمانان

لە بەشی پێشودا باسمان لە ڕووداوی دەرکەوتنی مەهدی لە کەعبە و ئەو سوپایەمان کرد کە دێن بۆ سەرکوتکردنی و لەناوبردنی !!

بێگومان ئەو هێزەش کە دێن بۆ لەناو بردنی مەهدی و سوپای موسوڵمانان، الله تعالی لەنێوان مەککە و مەدینە لەشوێنێك کە پێی دەوترێت بەیداء، ڕۆیان دەچێنێ بەناخی زەویدا ولەناو دەچن!!

بەڵام ئەم هێزە پێشتر شاری مەدینە دەگرن و وێرانی دەکەن!! لەوێوە بەڕێ دەکەون بەرەو مەککە، لە هەندێك فەرمودەش هاتوە کە سەرکردەکەیان کەسێکە بەناوی سوفیانی، هەرچەندە ئەو فەرموودانەی کە باسی سوفیانی دەکەن زەعیفن!!!

بەڵام هاتنی ئەو هێزەو کاولکردنی شاری مەدینە و ڕۆچونیان

لەنێوان شاری مەککە و مەدینەدا جێگیر بوە بە فەرمودەی سەحیح،

دوابەدوای ئەوەی کە مەهدی وسوپاکەی شۆڕش و جیهادەکەیان سەردەکەوێت کاری یەکەمیان پاك کردنەوەی وولاتی سعودیەیە لە تاغوتان،هەرلەو سەروبەندەدا ڕۆمەکانیش دوای شکاندنی هودنەکە، بە سوپایەکی قەبە وزلەوە کە ژمارەیان خۆی دەدات لە نزیکەی یەك ملیۆن سەرباز!! دێن بۆ لەناوبردنی موسوڵمانان ودەگەن بە سوریاو لە ناوچەی ئەعماق و دابق، جێگیر دەبن!!! سوپای مەهدیش لەوکاتەدا بەڕێدەکەون بەرەو شاری مەدینە و لەوێوە بەرەو خاکی شام بۆ بەرەنگاربونەوەی سوپای ڕۆم .

هەروەکوو پیغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى عليه وسلم: لا تَقُومُ السَّاعَةُ حتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بالأعْماقِ، أوْ بدابِقٍ، فَيَخْرُجُ إليهِم جَيْشٌ مِنَ المَدِينَةِ، مِن خِيارِ أهْلِ الأرْضِ يَومَئذٍ، فإذا تَصافُّوا، قالتِ الرُّومُ: خَلُّوا

بيْنَنا وبينَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقاتِلْهُمْ، فيَقولُ المُسْلِمُونَ: لا، واللَّهِ لا نُخَلِّي بيْنَكُمْ وبيْنَ إخْوانِنا، فيُقاتِلُونَهُمْ، فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لا يَتُوبُ اللَّهُ عليهم أبَدًا، ويُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ، أفْضَلُ الشُّهَداءِ عِنْدَ اللهِ، ويَفْتَتِحُ الثُّلُثُ، لا يُفْتَنُونَ أبَدًا فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطَنْطِينِيَّةَ، فبيْنَما هُمْ يَقْتَسِمُونَ الغَنائِمَ، قدْ عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بالزَّيْتُونِ، إذْ صاحَ فِيهِمِ الشَّيْطانُ: إنَّ المَسِيحَ قدْ خَلَفَكُمْ في أهْلِيكُمْ، فَيَخْرُجُونَ، وذلكَ باطِلٌ، فإذا جاؤُوا الشَّأْمَ خَرَجَ، فَبيْنَما هُمْ يُعِدُّونَ لِلْقِتالِ، يُسَوُّونَ الصُّفُوفَ، إذْ أُقِيمَتِ الصَّلاةُ، فَيَنْزِلُ عِيسَى ابنُ مَرْيَمَ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فأمَّهُمْ، فإذا رَآهُ عَدُوُّ اللهِ، ذابَ كما يَذُوبُ المِلْحُ في الماءِ، فلوْ تَرَكَهُ لانْذابَ حتَّى يَهْلِكَ، ولَكِنْ يَقْتُلُهُ اللَّهُ بيَدِهِ، فيُرِيهِمْ دَمَهُ في حَرْبَتِهِ)[١]

واتا: دونیا کۆتایی نایەت و قیامەت هەڵناسێت هەتا سوپای ڕۆم لە ئەعماق ودابق دادەبەزن، (ئەعماق ودابق دوو ناوچەن لە سوریا نزیکن

[١] - رواه مسلم .

لە یەکەوە)، لەوکاتەشدا سوپایەك لە شاری مەدینەوە بۆ بەرەنگاربونەوەیان دێن، لە چاکترین خەڵکی سەر زەوین، (سوپاکەی مەهدیە واللە اعلم) کاتێك هەردوو سوپاکە دەگەن بەیەك، ڕۆمەکان دەڵێن: بهێڵن با لەگەڵ ئەوانە شەڕ بکەین کە ئافرەتەکانیان بردین بە کەنیزەك (واتا: موسوڵمانە ئەوروپیەکان)، موسوڵمانەکانیش دەڵێن نا واللە ئێمە ناهێڵین ئەوانە برای ئێمەن،

پاشان جەنگەکە دەست پێ دەکات، بەشێکی لەسوپای موسوڵمانان ترس دایاندەگرێت و لە جەنگەکە هەڵدێن، اللە تعالى لەسەر ئەو کارەیان لێیان خۆش نابێت!! بەشێکیشیان شەهید دەبن و دەبنە چاکترین شەهیدەکان لەلای اللە تعالى!! بەشێکیشیان سەردەکەون بەسەر ڕۆمەکاندا، کە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) لەبارەیانەوە دەفەرموێت: هەرگیز تووشی فیتنە نابن، ئەم بەشەی سوپاکە بەرەوپێش دەچن هەتا شاری استانبوڵ دەکەنەوە بەڕووی موسوڵمانان،

لە کاتێکدا خەریکی دابەش کردنی غەنیمە و دەستکەوتەکانیانن، چەکەکانیشیان بە دار زەیتونەوە هەڵواسیوە!

شەیتان هاواریان لێ دەکات بە درۆ دەڵێت: مەسیحی دەججال دەرکەوتوە وا لەناو کەس وکارتانە، ئەوانیش دەگەڕێنەوە بەرەو شام، بەڵام کاتێك دەگەنەوە شام، لەو کاتەدا بەڕاستی دەججال بە شێوەی خۆی دەرکەوتوە، ئیتر موسوڵمانان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ جەنگ، لەوکاتەدا قامەت کراوە بۆ نوێژی بەیانی، پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام) دادەبزێت و دێتە ناویان، نوێژ دەکەن، کاتێکیش دەچن بۆ جەنگ و ڕووبەڕووبونەوە، دەججال پێغەمبەر عیسا دەبینێت و لە ترساندا دەتوێتەوە،بەڵام پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) دوای دەکەوێت، وازی لێ ناهێنێت هەتا دەیکوژێت.

بەکورتی و پوختی بەپێی فەرمودەکە ڕووداوەکان بەم جۆرەن :

- جەنگێك لەنێوان ڕۆم و وولاتانی ڕۆژئاوای دیکە دروست دەبێت، بۆ نموونە وەکوو(ڕوسیا و ئۆکڕانیا).
- هودنە وهاوپەیمانیەك لەنێوان ڕۆم و موسوڵمانان دروست دەبێت، بە هەردولایان لە دوژمنی سێیەم دەدەن .
- ڕۆم هودنەکە دەشکێنن وخیانەت لە موسوڵمانان دەکەن! سوپایەکی گەورە و زەبەلاح دەهێنن بۆ گیانی موسوڵمانن، لە هەمان کاتیشدا ئاڵا ڕەشەکان لە خوراسانەوە پەیدا دەبن، هەروەها مەهدیش لە سعودیەوە دەردەکەوێت.
- سوپایەکی گەورە لە شامەوە دێن بۆ سەرکوت کردنی جیهاد و شۆڕشەکەی مەهدی! ئەو سوپایە شاری رسول الله (علیه الصلاة والسلام) کاول و وێران دەکەن، پاشان لەنێوان مەککە و مەدینە ڕۆدەچن بەزەویدا .

- جەنگێکی دیکەی گەورە ڕوودەدات لە نێوانی موسوڵمانان بەسەرۆکایەتی مەهدی و سوپای ڕۆمەکان کە بە جەنگی(الملحمة الكبرى) ناسراوە، سەرەنجام بەسەرکەوتنی موسوڵمانان کۆتایی دێت.
- سوپای موسوڵمانان پێشڕەوی دەکەن، تا دەگەنە شاری استانبوڵ و فەتحی دەکەن.
- دوای فەتحی استانبوڵ موسوڵمانان دەگەڕێنەوە شام لەوێ دەججال بەشەخسی دەردەکەوێت.
- پیغەمبەرعیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام) دادەبەزێت و دەگەڕێتەوە دونیا لەگەڵ سوپای مەهدی جەنگ و کوشتار دەکەن بەرامبەر دەججال و سوپاکەی، پاشان عیسا (علیه الصلاة والسلام) بەدەستی خۆی دەججال دەکوژێت.

ئەم ڕووداوانەش بەم ڕیزبەندیە، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە چەندین فەرموودەی دیکەشدا باسی کردوە یەکێکی دیکەش لەو فەرمودانە!! هەروەکو دەفەرموویێت:

(عن معاذ بن جبل رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال:عمرانُ بيتِ المقدسِ، خرابُ يثربَ، وخرابُ يثربَ، خروجُ المَلحمةِ، وخروجُ الملحمةِ، فتحُ قسطنْطينيَّةِ ، وفتحُ القسطنطينيةِ خروجُ الدجالِ. ثم ضربَ بيدِهِ على فخذِ الذي حدَّثَ أو منكبِهِ ثم قال : إن هذا لحقٌّ كما أنَّك هنا ، أو كما أنك قاعدٌ . يعني : معاذَ بنَ جبلٍ).

واتا: موعاذی کوڕی جەبەل الله لێی ڕازی بێت دەڵێت پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: لەگەڵ گەشە سەندنی شاری قودس، کاول بوونی شاری مەدینەی لەگەڵدا دەبێت!! کاول بوونی شاری مەدینەش جەنگە گەورەکەی لەگەڵدا دەبێت (الملحمة الكبرى)!! جەنگە گەورەکەش فەتح و کردنەوەی شاری استانبوڵی

لەگەڵدا دەبێت! فەتحی شاری استانبوڵیش دەرکەوتنی دەجالی لەگەڵدا دەبێت!! پاشان پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەست دەخاتە سەر ڕانی موعاذ و دەفەرمووێت: ئەمەی باسم کرد حەققە هەروەکوو چۆن تۆ لێرە دانیشتوی .



## کۆتایی جەنگی الملحمة الكبرى و فەتح کردنی شاری (قوستەنتینیە) استانبوڵ بە ڕووی موسوڵمانان!!

لە بەشی پێشودا باسی جەنگە گەورەکەی نێوان ڕۆم و موسوڵمانانمان کرد کە بە جەنگی (الملحمة الكبرى) ناسراوە،

بێگومان بەپێی فەرموودەکان ساحە و گۆڕەپانی ئەو جەنگە لە ناوچەی شامە، بە دیاریکراویش لە سوریایە، کە لە چەندین فەرمودەو باس کراوە، سوپای ڕۆم لەناوچەی ئەعماق و دابق هێزەکانیان جێگیر دەکەن!

بەپێی فەرموودەکان هێزی موسوڵمانانیش لەو کاتەدا لە ناوچەی غوطەی شاری دیمەشقی پایتەختی سوریا جێگیر دەبن!! هەروەکوو لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

(عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: إنَّ فُسطاطَ المسلمين ، يومَ الملحمةِ ، بالغُوطةِ إلى جانبِ مدينةٍ يُقالُ لها : دمشقُ ، من خيرِ مدائنِ الشَّامِ)[1] .

واتا: پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: قەڵا و شوێنی موسوڵمانان لە ڕۆژی جەنگی مەلحەمە لە غۆطەیە لە شارێك پێی دەڵێن دیمەشق، کە یەکێکە لە چاکترین شارەکانی شام .

مەعلومی هەموو لایەکە لە ئێستادا غۆطە گەڕەکێکی گەورەی شاری دەیمەشقی پایتەختی سوریایە!!

هەروەها بەپێی فەرموودەکان باسی ئەوەشمان کرد کە دوابەدوای جەنگەکە دەججالی درۆزن بەشەخسی دەردەکەوێت!! ئیتر جەنگ لە نێوان موسوڵمانان و دەجال و سوپاکەی دەست پێ دەکات!!

[1] - رواه أبو داوود بسند صحيح .

ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە سوپای موسوڵمانان بە سەرۆکایەتی مەهدیە!!

فەرموودەش لەسەر ئەم جەنگ و کوشتارەی ڕۆم و موسوڵمانان زۆرن لەنێوان صەحیح و حەسەن و زەعیف، بەڵام بەگشتی بابەتەکە ثابت بوە بەصەحیحی، یەکێکیشە لەو فیتنە و ڕوداوگەلانەی ئاخری زەمان، لەو فەرمودانەش: (عن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: يجيش الروم على وال من عترتي أسمه يواطئ أسمي، فيلتقون بمكان يقال له العماق فيقتتلون فيقتل من المسلمين الثلث أونحو ذلك، ثم يقتتلون يوما آخرفيقتل من المسلمين نحو ذلك، ثم يقتتلون اليوم الثالث فيكون على الروم، فلا يزالون حتى يفتحوا القسطنطينية، فبينما هم يقتسمون فيها بالأترسة أذ أتاهم صارخ أن الدجال قد خلفكم في ذراريكم)[1].

---

[1] - رواه الخطيب في المتفق والمفترق.

واتا: ڕۆم سوپایەك دەنێرێت بۆسەر والیەکی موسوڵمانان ناوی وەکو ناوی من وایە، (کە زانایان دەڵێن مەهدیە)، کوشتار دەکەن لە شوێنێك پێی دەوترێت العماق (الأعماق) بەشێکی موسوڵمانان دەکوژرێت، پاشان ڕۆژێکی دیکە دەجەنگن، لەو جەنگەشیان بەشێکی تریش لە موسوڵمانان دەکوژرێن، دواتر لە سێیەم جەنگدا ڕۆم دەدۆڕێت و موسوڵمانان سەردەکەون، ئیتر موسوڵمانان پێشڕەوی دەکەن هەتا دەگەنە قوستەنتینیە (استانبوڵ)، لەو کاتەدا کە خەریکی دابەشکردنی دەستکەوتن، هاوارێك بەرز دەبێتەوە و دەڵێ دەججال دەرکەوتوە و والەناوکەس و کارو نەوەکانتانە .

کەواتە لە پاش سەرکەوتنی موسوڵمانان بەسەر ڕۆمدا لەو جەنگە گەورەیە، ئیتر سوپای موسوڵمانان پێشڕەوی دەکەن، هەتا دەگەن بە استانبوڵ، ئەو شارەش دەکرێتەوە بەڕووی موسوڵمانان و دەبێت بە بەشێك لە خاکی ئیسلام، دوابەدوای ئەو ڕووداوە گەورەیە، دەججال

دەردەکەوێت، ئیتر سوپای موسوڵمانان دەگەڕێنەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دەجال!

ماوەتەوە بڵێین ئایا شاری استانبوڵ چۆن دەکەوێتە دەستی موسووڵمانان و دەبێت بە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلام؟؟ ئایا جەنگی تیا دەکرێت یان نا؟؟ شاری استانبوڵ بەپێی هەموو فەرموودەکان جەنگ و کوشتاری تێدا ناکرێت بەڵکو بە تەکبیر و تەسبیح و تەهلیل دەکرێتەوە بەڕووی موسوڵمانان، چۆن ؟؟ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (ان المسلمين أذا نزلوا على المدينة التي جانب منها في البر وجانب منها في البحر، لم يقاتلوا بسلاح ولم يرموا بسهم، قالوا لاأله الاالله والله اكبر فيسقط أحد جانبها، ثم يقولوا الثانية لاأله الاالله والله أكبر فيسقط جانبها الأخر، ثم يقولوا الثالثة لاأله الاالله والله أكبر فيفرج لهم فيدخلوها)[1]

[1] -. رواه الأمام مسلم في صحيحه .

واتا: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: موسوڵمانان کاتێك دادەبەزن بۆ ئەو شارەی کە لایەکی لەسەر بەحرە و لایەکی دیکەی وشکانیە، بەچەك شەڕ ناکەن و تیریش تێناگرن، بەڵکو دەڵێن لاأله الاالله والله أکبرلایەکی دەکەوێت، بۆ جاری دووەم دەڵێن لاأله الاالله والله أکبر لایەکی دیکەی دەکەوێت، بۆسێیەم جاریش دەڵێن لاأله الاالله والله أکبر ئەکرێتەوە و دەچنە ناو شارەکە .

هەروەها پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە فەرموودەیەکی دیکە دەفەرمووێت: (ثم یخرج الیهم روقة المسلمین أهل الحجاز الذین لاتأخذهم في الله لومة لائم حتى یفتح الله علیهم قسطنطینیة ورومیة بالتسبیح والتکبیر)

واتا: پاشان سوپایەك لە چاکترین موسوڵمانەکانی حیجاز بۆیان دێن کە لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك ناترسن، هەتا الله تعالی لەسەر دەستی ئەوان استانبوڵ دەکاتەوە بەڕووی موسوڵمانان بە تەسبیح و تەکبیر .

ماوەتەوە بڵێین ماوەی نێوانی ئەم جەنگانە چەندە؟؟ جەنگی مەلحەمە (الملحمة الكبرى) لە دەستپێکردنی هەتا کۆتایی، پاشان کردنەوەی شاری استانبوڵ، پاشان دەرکەوتنی دەججال، ئایا نێوانی ئەم جەنگ و ڕووداوانە چەند ساڵە؟؟



# ئایا ماوەی جەنگی الملحمة الکبری هەتا دەرکەوتنی دەجال چەند ساڵە ؟؟؟

لە بەشی پێشووی بابەتەکەمان باسی کۆتای جەنگی (الملحمة الکبری) و فەتح کردنی (قوستەنتینیە)، شاری استانبوڵ مان کرد ،

بەپێی هەموو ئەو فەرمودانەی کە پێغەمبەرمان (علیە الصلاة والسلام) فەرموویەتی و باسی ئەو زنجیرە فیتنەیەمان بۆدەکات، هەمووی بەم تەسەلسولە هاتوە:

لە پیشان جەنگێکی گەورە لەنێوان ڕۆم و موسوڵمانان دروست دەبێت، کە بە جەنگی (الملحمة الکبری) ناسراوە، هەروەکوو لە بەشەکانی پێشوو بە درێژی باسمان کرد بە سەرکەوتنی موسوڵمانان تەواو دەبێت.

پاشان هێزو لەشکری موسوڵمانان بەرەو شاری استانبوڵ بەڕێ دەکەون و ئەو شارەش فەتح دەکەن، بەڵام بەبێ جەنگ و کوشتار!! بەڵکو بە تەسبیح و تەکبیر .

دوابەدوای ئەوەش دەججالی درۆزن دەردەکەوێت لە خوڕاسانەوە بەرەو شام دێت!! بەمەش یەکەم نیشانە لە نیشانە گەورەکانی کۆتایی دونیا دەرکەوت .

ماوەتەوە بڵێین ئایا ماوەی نێوانی جەنگی (الملحمة الكبرى) وفەتح کردنی شاری استانبوڵ ودەرکەوتنی دەججال چەندە ؟؟

لە فەرمودەیەك کە ئیسنادەکەی حەسەنە ئیمامی احمد و أبو داوود و ئیمامی تورمذی و ابن ماجه و حاکم ڕیوایەتیان کردوە، لە موعاذی کوڕی جەبەل الله لێی ڕازی بێت دەڵێت، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (الملحمة الكبرى وفتح القسطنطينية

وخروج الدجال في سبعة أشهر)

واتا: جەنگی الملحمة الکبری وکردنەوەی شاری استانبوڵ و دەرکەوتنی دەجال لە حەوت مانگدا ڕوودەدەن !!!

بەڵام لە فەرمودەیەکی دیکە کە ئیسنادەکەی لە نێوان صەحیح و حەسەنە ئیمامی احمد و أبو داوود و ابن ماجە ڕیوایەتیان کردوە، لە عبدالله ی کوڕی بسر الله لێی ڕازی بێت دەڵێت، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (بین الملحمة وفتح المدینة ست سنین ویخرج المسیح الدجال في السابعة).

واتا: لە نێوان جەنگی الملحمة و فەتح کردنی شار(کە مەبەست لێی شاری استانبوڵ)ە، شەش ساڵە، وە لە حەوتەمین ساڵ مەسیحی دەجال دەردەکەوێت.

أبو داوود دەڵێت ئەم فەرمودەیەیان صەحیح تر و ڕاستترە لەوەی پێشو، هەروەها دەفەرمووێت هیچ جیاوازی و ئیختیلافێکیش نیە لە نێوان ئەو دوو فەرمودەیە !!! چۆن ؟؟

لە فەرموودەی یەکەمیان کە دەفەرمووێت: حەوت مانگ مەبەست لێی لە تەواو بوونی جەنگەکەوە هەتا دەرکەوتنی دەججال حەوت مانگە، واتا: حەوت مانگ دوای تەواو بوونی جەنگەکە دەججال دەردەکەوێت !!!

لە فەرموودەی دوەمیشیان کە دەفەرموێت: حەوت ساڵ مەبەست لێی لە دەستپێکردنی جەنگەکەوە هەتا دەرکەوتنی دەججال حەوت ساڵ دەخایەنێت

هەروەها لە ڕیوایەتێکی دیکە کە هەر ابو داوود دەیگێڕێتەوە دەفەرمووێت: (ان بين فتح القسطنطينية وخروج الدجال سبع سنين)

ئەم ڕیوایەتە ضەعیفە .

واتا: لەنێوان فەتحی شاری استانبوڵ و دەرکەوتنی دەجال حەوت ساڵە !!

بەگشتی هەموو فەرمودە و ڕیوایەتەکان باس لەوە دەکەن کە نێوانی ئەو سێ ڕوداوە گەورەیە تەنها حەوت ساڵە .

بێگومان دەجال و فیتنەی دەجال بە گەورەترین فیتنە دادەنرێت بەدرێژایی مێژووی دونیا.

---



# بۆچی ترسناکترین وگەورەترین فیتنە فیتنەی دەججالە ؟؟!!

لە درێژەی باس کردنی فیتنە و جەنگ و ڕووداوەکانی ئاخری زەمان گەیشتینە فیتنەی دەججال !!

فیتنەی دەججال هەروەکو پێغەمبەری ئازیزمان (علیە الصلاة والسلام) لە چەندین فەرمودە باسی کردوە گەورەترین فیتنەیە لەسەر زەوی، هەر لە دروست بوونی باوکە ئادەم (علیە الصلاة والسلام) و هاتنە سەرزەوی، هەتا کۆتایی دونیا !!!

واتا : هیچ فیتنەیەك وەکوو فیتنەی دەججال خراپترو ترسناکتر نیە و نەبوە و نابێت !!!

هۆکارەکەشی بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە، لەوانە :

یەكەم: دەجچال لە كاتێكدا دەردەكەوێت خەڵكی لە ئەوپەڕی لاوازی ئیمان ودینداریدایە!! واتا: دین لەناو خەڵكیدا بەجۆرێك كاڵ بوەتەوە هەڵگرانی دینە ڕاستەقینەكە بەنامۆو ترسناك وتۆقێنەر ناو دەبرێن !!!

دوەم: دەجچال لەكاتێكدا دەردەكەوێت دونیا پڕ بوە لە شەڕو جەنگ وكوشتار!! ئەویش وەكو فریادڕەسێكی ئاشتی خۆی پیشان دەدات !!!

سێیەم: دەجچال لەكاتێكدا دەردەكەوێت دونیا بێ بارانی و قاتو قڕی و برسێتیەكی زۆری تێدا بڵاو بوەتەوە !! ئەویش نان و خۆراك دەبەخشێت و باران دەبارێنێت !!!

چوارەم: دەججال بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو مەسیحی ڕاستەقینەیە و گەڕاوەتەوە بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤایەتی لە برسێتی و قاتوقڕی و جەنگ و کوشتار! دواتریش بانگەشەی خوایەتی دەکات!

پێنجەم: هەموو شەیتانەکان لە ئینس و جن موسەخخەرن بۆی و یارمەتی تەواوی دەدەن و هەموو شتێکی بۆ دەکەن !!

لەبەر ئەم هۆکارانە و چەندین هۆکاری دیکەش، زۆرترین زۆری خەڵکی بڕوای پێ دەهێنن و دەبن بە شوێنکەوتەی خۆی و بەرنامەکەی !!

بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی، وای دابنێین لەکاتێکدا خەڵکی هیچ شتێك لەبارەی دینەکەیانەوە نازانن و تووشی جەنگ وکوشتارو برسێتی بوونە، منداڵ و کەسوکاریان وا خەریکە لەبەر چاویان لەبرسان دەمرن!! دارو دەستەکەی دەجالیش بانگەشە وڕیکلام دەکەن لە

هەموو لایەك ودەڵێن هەركەسێك بێتە ناو حیزب و گروپ و تاقمەكەمانەوە مانگانە چاكترین موچەی پێ دەدەین و بژێوی و خواردنیشیان بۆ دابین دەكەین !! ئیتر خەڵكی چۆن فریو ناخۆن و چۆن دوای ناكەون !!!

بۆ نموونە وەك دەبینن ئێستا لەم كاتەدا خەڵكی لە خۆشگوزەرانی و تێرو تەسەلیدا دەژین، هیچ كەمو كوڕیەكیان نیە، كەچی دوای طاغوتەكانودەجالۆكەكانی سەردەم كەوتون ودەنگیان پێ دەدەن و چەكیان بۆ هەڵدەگرن وخۆیان بۆ بەكوشت دەدەن!!!

لە كاتێكیشدا حەق وڕاستیەكەیان بۆ ڕوون دەكرێتەوە و ڕێگا ڕاستەكەیان پیشان دەدرێت لەبەرامبەردا دەڵێن ئێمە لەبەر بژێوی ژیان وپارە دەنگیان پێ دەدەین وچەكیان بۆ هەڵدەگرین ئەی چیجای لە كاتێكدا ئەگەر برسی وبێ نان وبێ مەعیشەت بن!!! ئیتر چۆن شوێنی دەجال ناكەون !!!

بەڵام بێگومان دەججال نان وخۆراك وپارە وخۆشگوزەرانی دونیا هەروا بێ بەرامبەر بۆ شوێنکەوتەکانی دابین ناکات، بەڵکو لەسەر حیسابی دین وئیمان وئاخیرەتیان ئەوە دەکات!! واتا: شوێنکەوتەکانی دەججال ئاخیرەتیان دەفرۆشن بۆ دونیا !!!

لەبەر ئەم هۆکارانەی باسمان کرد پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام بە خراپترین فیتنە ناوی دەبات و زۆرترینی خەڵکیش شوێنی دەکەون خوا پەنامان بدات !!!



## کەسایەتی دەجال کێیە چۆنە؟؟

لە درێژەی باسەکەمان لەسەر فیتنەکانی ئاخری زەمان، پێش کۆتایی هاتنی دونیا، گەیشتینە فیتنەی دەجال، کە فەرمودەیەکی زۆری لەسەر وتوراوە و جەختیشی زۆر لەسەر کراوەتەوە !!!

لە بەشی پێشوودا باسمان لەوە کرد کە بۆچی فیتنەی دەجال گەورەترین وترسناکترین فیتنەیە لە دونیادا ؟؟ لەم بەشەشدا پشتیوان بە الله تعالی باس لە کەسایەتی دەجال دەکەین .

دەجال پیاوێکە لە نەوەی ئادەم، کۆمەڵێك سیفات ونیشانەی هەیە کە لە چەندین فەرمودەی خۆشەویستمان محمد (علیه الصلاة والسلام) هاتوە، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە خەڵکی بتوانن بیناسنەوە و خۆیانی لێ بپارێزن،

لەو سیفات نیشانانەش کە هاتوە لەسەری بە پێی فەرموودەکان:

گەنجێکی سورەی دەموچاو خڕی باڵا کورتە، قژی لولە و ناوچەوانی پانە وملیشی ئەستورە، چاوی ڕاستی کوێرە، تەنها سپێنێکەی هەیە، چاوی چەپیشی گۆشتێکی زیادەی لەسەرە بەڵام دەبینێت!!

لەسەر ناوچەوانی و لەنێوانی هەردو چاویدا نوسراوە کافر یان بە پیت (ك، ف، ر) هەموو موسوڵمانێك دەتوانێت بیخوێنێتەوە ئەگەر خوێندەواری هەبێت یان نا !!!

جا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: باشە بۆچی تەنها موسوڵمان دەتوانێت بیخوێنێتەوە ئەگەرچی خوێندەواریشی نەبێت؟؟!!! بەڵام کافرو مونافیقان ناتوانن بیخوێننەوە ئەگەرچی خوێندەواریشیان هەبێت وگەورەترین بڕوانامەشیان هەبێت !!!!

بێگومان ئەو کافرە کە لەنێوان چاوەکانی دەججال نووسراوە نووسینێکی (ئیفتیڕازیە) !! بەمانای ئەوە دێت نووسراوێکی ڕوون و ئاشکرا نیە بە نووسین بەڵکو کوفرێکی واقعی بەرجەستەکراوی دیارو ئاشکرایە لە خودی کەسایەتی دەججالدا هەیە، جا کەسێك خاوەن بەصیرە بێت ئەو کوفرەی نێوچەوانی دەججال دەبینێت و کەسایەتی دەججال دەناسێتەوە!! واتا: بەچاوی دڵ دەیبینێت نەك بەچاوی سەر کە هەموو کەسێکی ئاسایی دەتوانێت شتی پێ ببینێت .

ئەو بەصیرە و بەرچاوڕونیەش الله تعالی تەنها دەیدات بە موسوڵمانێکی دڵسۆزی خاوەن تەقوا، جا خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار!!! بەڵام مونافیق و بەناو موسوڵمانی ئەم سەردەمە کە دینەکەی تەنها بە زارەکی وڕۆتین گرتوە، ئەگەر بڕوانامەی دکتۆڕاشی هەبێت لە دین وشەریعە، هەرگیز نایناسێتەوە و کوفرەکانی نابینێت!! بەڵکو لەوانەیە دەججال بە کەسێکی فریادڕەس و رزگارکەر دەزانێت!

هەندێك لەو فەرمودانەش کە باس لە سیفات و شێوەی دەججال دەکەن، لەوانە:

١. عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي أَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ فَإِذَا رَجُلٌ آدَمُ سَبْطُ الشَّعَرِ بَيْنَ رَجُلَيْنِ يَنْطُفُ رَأْسُهُ مَاءً فَقُلْتُ مَنْ هَذَا قَالُوا ابْنُ مَرْيَمَ. فَذَهَبْتُ أَلْتَفِتُ فَإِذَا رَجُلٌ أَحْمَرُ جَسِيمٌ جَعْدُ الرَّأْسِ أَعْوَرُ الْعَيْنِ الْيُمْنَى كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ قُلْتُ مَنْ هَذَا قَالُوا هَذَا الدَّجَّالُ ، أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا ابْنُ قَطَنٍ). وَابْنُ قَطَنٍ رَجُلٌ مِنْ بَنِي الْمُصْطَلِقِ مِنْ خُزَاعَةَ)[١].

واتا: عبدالله ی کوڕی عومەڕ الله لەخۆی و باوکی ڕازی بێت فەرموی: پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (من خەوتبوم و لە خەونمدا بینیم کە تەوافی کەعبە دەکەم، پیاوێکم بینی لەنێوانی دوو پیاودا، قژێکی سافی هەبوو ئاوی لێ دەتکا، وتم ئەوە کێیە؟ وتیان

[١] - رواه البخاري برقم ٦٥٠٨ .

کوڕەکەی مەریەمە. پاشان ئاوڕم دایەوە پیاوێکی سورەی چوارشانەم بینی قژیکی لوولی هەبوو چاوی لای ڕاسی تەواو نەبوو لە دەنکە ترێیەکی پوج دەچوو، منیش وتم ئەوە کێیە؟ وتیان دەججالە)) .

٢. وعن ابن عمر رضي الله عنهما أن رسول الله صلى الله عليه وسلم ذكر الدجال بين ظهراني الناس فقال : " إِنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ ، أَلا إِنَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ أَعْوَرُ الْعَينِ الْيُمْنَى كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ)[١].

واتا: عبدالله ی کوڕی عومەڕ الله لەخۆی و باوکی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (الله تعالی کوێر نیە، بەڵام مەسیحی دەججال چاوی لای ڕاستی کوێرە وەکوو دەنکە ترێیەکی پوچ وایە).

[١] - رواه البخاري برقم ٣١٨٤

٣. وفي حديث حذيفة رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ((الدَّجَّالُ أَعْوَرُ الْعَينِ الْيُسْرَى، جُفَالُ الشَّعَرِ كَثِيرُهُ مَعَهُ جَنَّةٌ وَنَارٌ فَنَارُهُ جَنَّةٌ وَجَنَّتُهُ نَارٌ)[1]. واتا: لە فەرموودەکەی حوذەیفە الله لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (دەججال چاوی لای چەپی تەواو نیە، قژی لوولێکی پڕە، بەهەشت و دۆزەخی پێیە، بەڵام بەهەشتەکەی دۆزەخە و دۆزەخەکەشی بەهەشتە).

٤. وفي حديث أنس رضي الله عنه: قال النبي صلى الله عليه وسلم: (مَا بُعِثَ نَبِيٌّ إِلا أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الأَعْوَرَ الْكَذَّابَ أَلا إِنَّهُ أَعْوَرُ وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ وَإِنَّ بَينَ عَيْنَيْهِ مَكْتُوبٌ كَافِرٌ)[2]. واتا: لەفەرمودەکەی ئەنەس الله لێی ڕازی بێت لەپێغەمبەری خواوە (عليه الصلاة

[1] - رواه مسلم برقم ٥٢٢٢ .

[2] - رواه البخاري برقم ٦٥٩٨، وفي رواية : " وَمَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ ك ف ر " مسلم برقم ٥٢١٩، وفي رواية عن حذيفة : (يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ كَاتِبٍ وَغَيْرِ كَاتِبٍ) مسلم برقم ٥٢٢٣ .

والسلام) فەرمووی: (هەر پێغەمبەرێك هاتبێتە سەر زەوی ئیللا ئوممەتەكەی ئاگادار كردوەتەوە لە ئەو كوێرە درۆزنە، ئەوە بزانن كە ئەو كوێرە بەڵام خوای ئێوە كوێر نیە لەنێوان هەردو چاویشیدا نوسراوە كافر). لەڕیوایەتێكی دیكە: (نوسراوە ك ف ر). هەروەها لە ڕیوایەتێكی دیكە: (هەموو ئیماندارێك دەیخوێنێتەوە ئەگەر خوێندەواری هەبێت یان نەیبێت).

٥. وعن عبادة بن الصامت رضي الله عنه : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنِّي قَدْ حَدَّثْتُكُمْ عَنْ الدَّجَّالِ حَتَّى خَشِيتُ أَنْ لا تَعْقِلُوا، إِنَّ المَسِيحَ الدَّجَّالِ رَجُلٌ قَصِيرٌ أَفْحَجُ جَعْدٌ أَعْوَرُ مَطْمُوسُ الْعَيْنِ لَيْسَ بِنَاتِئَةٍ وَلا حَجْرَاءَ فَإِنْ أُلْبِسَ عَلَيْكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ)[1]

[1] - رواه أبو داود برقم ٣٧٦٣ ، والحديث صحيح ( صحيح الجامع الصغير/حديث رقم٢٤٥٥) .

واتا: عوبادەی کوڕی صامت الله لێی ڕازی بێت فەرموی: پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (من باسی دەجالم بۆ کردن، لەوە ترسام کە تێنەگەیشتبن، مەسیحی دەجال پیاوێکی بچکۆلەی خڕیلەی قژلوولە چاوی کوێری پوکاوەیە نە داخراوە نە زەقیشە، ئەگەر لێتان تێکچوو بیزانن کە خوای ئێوە کوێر نیە).

٦. وفي حديث أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (وَأَمَّا مَسِيحُ الضَّلالَةِ فَإِنَّهُ أَعْوَرُ الْعَيْنِ أَجْلَى الْجَبْهَةِ عَرِيضُ النَّحْرِ فِيهِ دَفَأٌ إنحناء)[١]. واتا: لە فەرمودەکەی ئەبو هوڕەیرەش الله لێی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (مەسیحی گومڕاکەر چاوی کوێرە ناوچەوانی قۆقزە و ملیشی پانە کەمێکیش پشتی چەماوەیە).

[١] - رواه أحمد برقم ٧٥٦٤

هەروەها کۆمەڵێکی زۆر فەرموودەی دیکەی لەسەرە کە باس لە فیتنە و دەسەڵات و چۆنێتی دەرکەوتن وشەڕ کردنی لەگەڵ موسوڵمانان وە هەروەها کۆتایی هاتنیشی دەکەن، پشتیوان بە الله تعالی باسیان دەکەین بەدرێژی . لەگەڵمان بن .



## لە کاتی دەرکەوتنی دەجال بە شەخسی خۆی ژیان لەسەر زەوی چۆن دەگوزەرێ ؟؟

بەپێی هەموو ئەو بەڵگەو فەرمودانەی کە باس لە هاتنی دەجال و نیشانەکانی دەرکەوتنی دەکەن، دەجال لە کاتێکدا بە شەخسی خۆی دەردەکەوێت ودێتە دونیاوە تەنها چل ڕۆژ دەمێنێتەوە لەسەر زەوی بەڵام بەم کاتە کەمە هەموو دونیا دەگەڕێت تەنها دوو شوێن نەبێت ئەویش مەککەومەدینە!

پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) لە فەرمودەیەکی صەحیحدا کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە دەفەرمووێت: (عن فاطمة بنت قيس رضي الله عنها في حديث الجساسة، أن الدجّال قال: (وَإِنِّي أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِي فِي الْخُرُوجِ، فَأَخْرُجَ فَأَسِيرَ فِي الأَرْضِ فَلا أَدَعَ قَرْيَةً إِلا هَبَطْتُهَا فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَيَّ كِلْتَاهُمَا كُلَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ وَاحِدَةً أَوْ وَاحِدًا مِنْهُمَا اسْتَقْبَلَنِي مَلَكٌ بِيَدِهِ

السَّيْفُ صَلْتًا يَصُدُّنِي عَنْهَا ، وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلائِكَةً يَحْرُسُونَهَا)

واتا: (فاتیمەی کچی قەیس دەگێڕێتەوە لە فەرمودەکەی کە باسی جەسساسە دەکات، دەججال بە کۆمەڵەکەی تەمیم الداری وتوە: منیش زۆرم نەماوە بۆ ئەوەی ئیزنی هاتنە دەرەوەم پێ بدەن، دەردەچم بەسەرهەموو زەویدا دەگەڕێم لەماوەی چل شەودا تەنها بۆم نیە بچمە مەککە و مەدینە، چونکە حەرام کراوە لەسەرم، هەر جارێك بمەوێت بچمە ناویانەوە فریشتەیەك بەشمشێرێکی تیژەوە لەبەرامبەرم ڕاوەستاوە و ڕێگریم لێ ئەکات، لەسەر هەموو سوچێکیشی فریشتەیەك ڕاوەستاوە).

کاتێکیش دەردەچێت دونیا لەو کاتەدا تووشی ئەم گۆڕانکاری و تێکچونانە بووە:

١. دونیا تووشی جەنگێکی کاولکاری و وێرانکار بوە کە زۆربەی وولاتانی گرتوەتەوە .

٢. نەخۆشی و دەرد و پەتای کوشندە زۆرو بەربلاوە .

٣. ئاسمان بە ئەمری الله تعالی بارانی گرتوەتەوە و قات وقڕی وبرسێتی و گرانیەکی زۆر بەرۆکی دونیای گرتۆتەوە .

٤. زولم و ستەم و ناعەدالەتی هەموو جێگەیەکی داپۆشیوە زۆر بە ڕوون وئاشکرایی دەبینرێت لەو سەردەم و زەمانەدا .

٥. دین و ئیمان و ئیسلامەتی بەجۆرێك کاڵ بوەتەوە کە هەڵگرانی ڕاستەقینەی ئەو دینە زۆر غەریب و نامۆن لەو کات وسەردەمەدا

٦. فاحیشە و خراپەکاری وبەدڕەوشتی وتاوانی ڤێزەون ئەوەندە زۆرو بلاوە کە خەڵکی لەو سەردەمە هیچ حیسابی بۆ ناکەن و زۆر بە سادە وئاسایی لێی دەڕوانن .

هەربۆیە ئەویش لەو کاتەدا دەردەکەوێت و خۆی وەکوو فریادڕەسێك پیشان دەدات ،

لە سەرەتادا وەکوو پێغەمبەرێك(مەبەست لێی خۆی وەکوو پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) دەناسێنێت) دواتر بانگەشەی خوایەتی دەکات و دەڵێت من خوام ،

کە ژیانێکی ئاسودەو خۆشگوزەران بۆ شوێنکەوتوانی فەراهەم دەکات جا چ لەڕووی خۆراك وئاو و ئیش و کارو پارە وپول و هەموو خۆشگوزەرانیەکانی دونیا.

بێگومان زۆرترین خەڵکیش دوای دەکەون و قیامەتیان دەدۆڕێنن بۆ پاروە نانێك(مەعاش وموچە)،

دەبێت ئەوەش بزانین پێش ئەوەی دەججال دەرکەوێت، سەربازە دڵسۆزەکانی شەیتان لە ئینس و جن، زەمینەیان بۆ ڕەخساندوە بۆ

هاتنی وە دونیا ئامادە کراوە بۆ دەرکەوتنی و پێشوازی کردنی ،

هەروەکوو ئێستا بە چاوی خۆمان دەبینین کە چی ئامادەکاری و زەمینەسازیەك دەکرێت بۆ هاتنی.

- ئەوە چەندین ساڵە جەنگ بەرۆکی دونیای گرتوە هەر لە شۆڕشەکانی بەناو (بەهاری عەرەبی) وولاتانی عەرەبەوە هەتا دەگاتە ئەفغانستان وعیراق وجەنگی ڕوسیا و ئۆکڕاینا وجەنگی ئیسڕائیل و فەلەستینو لوبنان وسوریا، کە گومانی تێدا نیە ئەم جەنگانە دەستپێکی جەنگێکی جیهانیەو سەربازەکانی شەیتان لە ئەمریکا و ئیسرائیل بوونە بە هەڵگیرسێنەری .

- هەروەها ئەوە بۆ چەند ساڵێك دەچێت نەخۆشی و دەرد و پەتا بڵاو کراوەتەوە لە دونیادا!! وەکوو (ڤایرۆسەکانی ئیبۆلا ، کۆڕۆنا ، ئەنفلەوەنزای بەراز، ئاوڵەی مەیمون) .

- قات و قڕی و گرانیش لە دونیادا بە گشتی سەریهەڵداوە تەنانەت لە هەندێك شوێن و ناوچە بۆ ساڵێك دەچێت هیچ بارانێك نەباریوە .

- ئەوە زوڵم و ستەم و ناعەدالەتیش هەر لە باسکردن نایەت کە زۆر بە ئاشکرا دیارە بەتایبەتی دژ بە هەڵگرانی ئەهلی تەوحید و ئاڵای لا أله الا الله ، هەروەها دینە ڕاستەقینەکەی الله تعالاش بەجۆرێك نامۆ بوە کە هەڵگرانی یان بە کۆنەپەرست و تیرۆریست لە قەڵەم دەدرێن یان جۆرەها تۆمەتی ناڕەوا دەدرێتە پاڵیان و دەگیرێن و لەزیندانەکان ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن.

- فاحیشە و تاوان و خراپەکاریش بەشێوازێکی زۆر ترسناك بەربڵاوە ودەبینرێت و بەئاشکرا ڕەواجی پێ دەدرێت هەتا ئەوەی هیچ کەس ناتوانێت ئامۆژگاری کەسانی تر بکات بۆ خۆپاراستن لە تاوان و خراپەکاری لەژێر ناوی ئازادی تاکەکەسی!!! والله المستعان .

لە کۆتاییدا دەڵێین ئێمە ئێستا لە سەروبەندی هاتنی دەججال داین واللە اعلم!! وە هەموو نیشانەکانی هاتنی، ئێستا دەبینرێت و زۆر نزیکین لەو فیتنە گەورەیە خوا پەنامان بدات ،

بەڵام ئەوەی کە زۆر گرنگە بیزانین ئەویە کە ئێمە هەر دەمرین ئەگەر بە جەنگ بێت، نەخۆشی، یان بە برسێتی، یان بەهەر جۆرێکی دیکە بێت مردنێکمان لەسەرە.

بەڵام گرنگ ئەوەیە دامەزراو بین لەسەر دین و ئیمان وعەقیدەی ڕاست و دروستی لاالە الااللە، نەبینە شوێنکەوتەی دەججال و دەججالۆکەکانی ئەم سەردەمەو دونیاو قیامەتمان لە دەست نەدەین.



# شوێنی دەرکەوتن و کۆتایی هاتنی دەجال

بەپێی فەرمودەکانی پێغەمبەری ئازیزمان (علیه الصلاة والسلام) دەججال لە خۆرهەڵاتی دورگەی عەرەبی و لە خوڕاسانەوە دەردەکەوێت، بەدیاریکراویش لە ئەصبەهان !!!

بێگومان خوراسانیش لە ئێستادا ئێران و بەشێك لە ئەفغانستانە، ئەصبەهانیش شارێکە لە ئێران!! لەئێستاشدا پێی دەوترێت (ئەسفەهان) لەم شارەش جولەکەیەکی زۆر نیشتەجێن کە لە جولەکەکانی ئێرانن!! هەربۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (عن أبي بكر الصديق رضي الله عنه قال: حدّثنا رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: الدَّجَّالُ يَخْرُجُ مِنْ أَرْضٍ بِالْمَشْرِقِ يُقَالُ لَهَا خُرَاسَانُ). واتا: دەجال لە خاکێك لە ڕۆژهەڵات دەردەکەوێت پێی دەوترێت خوراسان .

یان دەفەرمووێت: (عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: يَخْرُجُ الدَّجَّالُ مِنْ يَهُودِيَّةِ أَصْبَهَانَ مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ الْيَهُودِ عَلَيْهِمْ التِّيجَانُ).

واتا: دەججال لەناو جولەکەکانی ئەسبەهان دەردەکەوێت، حەفتا هەزاریش لەو جولەکانە لەگەڵیدان کە هەموویان تاجی پاشایان لەسەرە !!

بەڵێ دەججال لە خوراسان ولە شاری ئەسفەهان دەردەکەوێت بەڵام لەوێ وەکوو پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم خۆی دەناسێنێت، دواتر دێتە کوردستان لەوێ ئیعلانی خوایەتی دەکات !!!

لەوانەیە پرسیارێکتان لا دروست ببێت: کە ئایا چۆن و بۆچی دێتە کوردستان ؟؟!!!

لە فەرمودەیەکی درێژ کە ئیمامی موسلم لە صەحیحدا هێناویەتی، النواس بن سمعان الله لێی ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ، فَخَفَّضَ فيه وَرَفَّعَ، حتَّى ظَنَنَّاهُ في طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَلَمَّا رُحْنَا إِلَيْهِ عَرَفَ ذلكَ فِينَا، فَقالَ: ما شَأْنُكُمْ؟ قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ غَدَاةً، فَخَفَّضْتَ فيه وَرَفَّعْتَ، حتَّى ظَنَنَّاهُ في طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَقالَ: غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِي علَيْكُم، إنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ، فأنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ، وإنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ، وَاللَّهُ خَلِيفَتي علَى كُلِّ مُسْلِمٍ، إنَّه شَابٌّ قَطَطٌ، عَيْنُهُ طَافِئَةٌ، كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ بعَبْدِ العُزَّى بنِ قَطَنٍ، فمَن أَدْرَكَهُ مِنكُمْ، فَلْيَقْرَأْ عليه فَوَاتِحَ سُورَةِ الكَهْفِ، إنَّه خَارِجٌ خَلَّةً بيْنَ الشَّأْمِ وَالْعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِينًا وَعَاثَ شِمَالًا، يا عِبَادَ اللهِ فَاثْبُتُوا. قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، وَما لَبْثُهُ في الأرْضِ؟ قالَ: أَرْبَعُونَ يَوْمًا؛ يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ، وَسَائِرُ أَيَّامِهِ

كَأَيَّامِكُمْ قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، فَذلكَ اليَوْمُ الذي كَسَنَةٍ، أَتَكْفِينَا فيه صَلَاةُ يَومٍ؟ قالَ: لَا، اقْدُرُوا له قَدْرَهُ، قُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ، وَما إِسْرَاعُهُ في الأرْضِ؟ قالَ: كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ، فَيَأْتي علَى القَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ، فيُؤْمِنُونَ به وَيَسْتَجِيبُونَ له، فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ فَتُمْطِرُ، وَالأرْضَ فَتُنْبِتُ، فَتَرُوحُ عليهم سَارِحَتُهُمْ أَطْوَلَ ما كَانَتْ ذُرًا، وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعًا، وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ، ثُمَّ يَأْتي القَوْمَ، فَيَدْعُوهُمْ، فَيَرُدُّونَ عليه قَوْلَهُ، فَيَنْصَرِفُ عنْهمْ، فيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ ليسَ بأَيْدِيهِمْ شيءٌ مِن أَمْوَالِهِمْ، وَيَمُرُّ بالخَرِبَةِ، فيَقولُ لَهَا: أَخْرِجِي كُنُوزَكِ، فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ، ثُمَّ يَدْعُو رَجُلًا مُمْتَلِئًا شَبَابًا، فَيَضْرِبُهُ بالسَّيْفِ فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الغَرَضِ، ثُمَّ يَدْعُوهُ فيُقْبِلُ وَيَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ، يَضْحَكُ. فَبيْنَما هو كَذلكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ المَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ المَنَارَةِ البَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعًا كَفَّيْهِ علَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ، إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وإذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ منه جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، فلا يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلَّا مَاتَ،

وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُهُ حتَّى يُدْرِكَهُ ببَابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلُهُ)

واتا: جارێکیان پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) باسی دەججالی بۆ دەکردین، دەنگی بەرز ونزم دەکردەوە، بەجۆرێك تێگەشتین کە دەججال لەنزیکی ئێمە دایە و لەناو دارخورماکانە، کاتێك دەوریان چۆڵ کرد، بەڵام هەندێکمان گەڕاینەوە بۆلای، ئەویش هەستی کرد کە شتێك لە دڵماندایە!!

فەرمووی: چیتان دەوێت؟؟

ئێمەش وتمان: بابەتی دەججال سەرقاڵی کردوین!!

ئەویش فەرمووی: ئەوەی کە لێتان دەترسم لە دەججال ئەوەیە، ئەگەر دەرچوو من لەناوتان بووم ئەوە ترستان نیە چونکە من لەگەڵتانم و من بەڵگەم بەسەریەوە، بەڵام ئەگەر دەرچوو من لەناوتان نەمابوم ئەوە هەرکەسە خۆی بەڵگەیە بەسەر خۆیەوە، دەبێت خۆی ڕزگار بکات،

الله تعالاش بەڵگەیە بۆ هەموو موسوڵمانێکەوە، ((واتا: دەست گرتن بەکتێبەکەی الله دەبێتە پارێزەرو قەڵغان بۆ تاکی موسوڵمان))،

پاشان فەرمووی: ئەو گەنجێکی خڕیلەیە، چاوێکی دەڵێی پوکاوەتەوە، لە عبدالعزای کوڕی قەطن دەچێت، هەرکەسێك لەئێوە گەیشت پێی با ئایەتەکانی یەکەمی سورەتی الکەهفی بەسەردا بخوێنێت،

پاشان فەرمووی: ئەو لە نێوان شام وعیراقدا دەردەچێت، (بەپێی نەخشەی ئەوکاتەی شام وعیراق نێوان شام و عیراق ئەکاتە کوردستانی باشور)!!! (بەپێی فەرمودەکان: لە خوڕاسانەوە دەر دەکەوێت بەڵام لە کوردستان ئیعلانی خوایەتی خۆی دەکات)!!!

هەربۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: بە ڕاست وچەپدا دەگەڕێت، بەڵام ئێوە ئەی بەندەکانی الله خۆڕاگربن.. (واتا: کاتێك دەڵێت من خوام فریو نەخۆن بە قسەکانی بڕوا نەکەن).

پاشان دەڵێت وتمان: یارسول الله چەند دەمێنێتەوە لەسەر زەوی ؟؟

فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژێكیان وەكوو ساڵێك وایە، ڕۆژێكیان وەكوو مانگێك وایە، ڕۆژێكیشیان وەكوو هەفتەیەك وایە، باقی ڕۆژەكانی دیكەی وەكوو ڕۆژی ئێوەیە،

وتمان: یارسول الله ئەو ڕۆژەی كە وەكوو ساڵێك وایە هەر نوێژی یەك ڕۆژ بكەین؟؟

فەرمووی: نەخێر، بەڵكو خۆتان مەزەندەی بكەن بەپێی درێژی ڕۆژەكە!! وتمان: یارسول الله ئەی درێژی فیتنەكەی چەندە؟؟

فەرمووی: وەكوو بارانێك وایە بە باوە ببارێت!! ئەدات بەسەر قەومێكدا بانگەوازیان دەكات وئیمانی پێ دەهێنن و وەڵامی دەدەنەوە، ئەویش لەبەرامبەردا بارانیان بۆ دەبارێنێت و زەویان بۆ پڕ دەكات لە دەغڵ ودان و دەوڵەمەندیان دەكات .

پاشان دەچێتە لای قەومێکی دیکە و بانگەوازیان دەکات، بەڵام بەدەنگی بانگەوازەکەیەوە ناچن، ئەویش وازیان لێ دەهێنێت و تووشی برسێتی و قات وقڕی دەبن، (واتا: ئەگەر پشت لە دین و بەرنامەی الله بکەیت و دوای دین و بەرنامەی ئەو بکەویت نان و خواردن و پارە وپوڵت پێ دەدات، بەڵام ئەگەر دەست بگریت بە دینەکەتەوە و دوای نەکەویت ئەوە تووشی برسێتی و هەژاری و قات وقڕیت دەکات).

هەروەها بەلای هەر شوێنێکی کاولەوە دەڕوات گەنجینە و خەزێنەکانی دەردەکات و دوای دەکەون وەکوو شاری هەنگ، (واتا: هەموو خێرو بێری سەر زەوی لە دەستی ئەو دەبێت).

یەکێکی دیکە لە فیتنەکانی: بانگ لە گەنجێکی قەڵەو دەکات و دەیکات بە دوو لەتەوە، پاشان چاکی دەکاتەوە و گەنجەکە پێدەکەنێت!

پاشان پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: لەئان وساتی ئەو فیتنانەیدا ، الله تعالی مەسیحی کوڕی مەریەم دەنێرێت، لە ئاسمانەوە دادەبەزێت لەلای مەنارە سپیەکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری دیمەشق، کراسێکی زەردی لەبەردایە، دەستی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە، ئەگەر سەری نەوی بکات ئاوی لێ ئەتکێ، ئەگەر بەرزیشی بکاتەوە وەکوو مرواری تکەی ئاوەکان بەرز دەبێتەوە، هەر کافرێك بۆنی هەناسەی بکات دەمرێت، کاتێکیش دادەبەزێت دوای دەجال دەکەوێت هەتا دەگاتە دەرگای لود لەوێ دەیکوژێت . (دەرگای لود نزیکەی سی کیلۆمەتر لەشاری قودسەوە دوورە) لەو شوێنە دەجال دەکوژرێت و فیتنەکانی بۆ هەتا هەتا کۆتایی دێت .......

بەمەش فیتنەی دەجال کۆتایی دێت ، پاشان عیسای کوڕی مەریەم و لەشکری موسوڵمانان جەنگی جولەکە و دەوڵەتی ئیسڕائیل دەکەن !!!

## جەنگی سوپای موسوڵمانان وپێغەمبەر عیسا (علیه السلام) لەگەڵ جولەکەو کۆتایی هاتنی دەوڵەتەکەیان

دوابەدوای جەنگی سوپای موسوڵمانان لەگەڵ دەججالی درۆزن و کۆتایی پێ هێنانی ئەو فیتنە گەورەیە بە دەستی پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام)، لە شاری قودس (لە دەرگای لود باشوری شاری قودس)، کە لە بەشی پێشودا باسمان لێوە کرد،

بەگوێرەی فەرمودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (علیه الصلاة والسلام) دوای کۆتایی هاتنی دەججالل، ڕاستەوخۆ سوپای موسوڵمانان جەنگ لەگەڵ جولەکە و دەوڵەتی زایۆنی ئێستا دەست پێ دەکەن!

لە فەرموودەیەکی صەحیح کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە، جابری کوڕی عبدالله دەگێڕێتەوە، کە ئەمە بەشێکیەتی پێغەمبەری

خوا (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (فَيَنْطَلِقُونَ فَإِذَا هُمْ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتُقَامُ الصَّلاةُ فَيُقَالُ لَهُ تَقَدَّمْ يَا رُوحَ اللَّهِ فَيَقُولُ لِيَتَقَدَّمْ إِمَامُكُمْ فَلْيُصَلِّ بِكُمْ فَإِذَا صَلَّى صَلاةَ الصُّبْحِ خَرَجُوا إِلَيْهِ قَالَ فَحِينَ يَرَى الْكَذَّابُ يَنْمَاثُ كَمَا يَنْمَاثُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ فَيَمْشِي إِلَيْهِ فَيَقْتُلُهُ حَتَّى إِنَّ الشَّجَرَةَ وَالْحَجَرَ يُنَادِي يَا رُوحَ اللَّهِ هَذَا يَهُودِيٌّ فَلا يَتْرُكُ مِمَّنْ كَانَ يَتْبَعُهُ أَحَدًا إِلا قَتَلَه)[١] .

واتا: (پاشان سوپای موسوڵمانان دەیانەوێت بڕۆن بەرەو جەنگ، دەبینن عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام) لە ئاسمانەوە دادەبەزێت، پێی دەڵێن: ئەی رووحی الله فەرموو پێشکەوە پێشنوێژیمان بکە.

ئەویش دەفەرموێت: بائیمامەکەتان پێشکەوێت و پێشنوێژی بکات، کاتێکیش نوێژی بەیانی دەکەن دەکەونەڕێ بۆ ڕوبەڕوبونەوەی

[١] - رواه مسلم .

دەججال، کاتێکیش دەججال پیغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) دەبینێت خەریکە بتوێتەوە وەکو چۆن خوێ لەئاودا دەتوێتەوە بەڵام عیسای کوڕی مەریەم بەرەو ڕووی دەچیت و دەیکوژێت،

لەوە بەدوا کوشتاری جولەکە دەست پێدەکات هەتاوەکوو دار و بەرد دێنە قسە هاواری لێ دەکەن، ئەی ڕووحی الله ئەوە جولەکەیەکە بیکوژن!! بۆیە هیچ کەسێك نامێنێت لەوانەی کە شوێن دەججال کەوتون، هەموویان دەکوژرێن).

هەروەها لە فەرمودەیەکی صەحیحدا کە ئیمامی بوخاری لە صەحیحدا هێناویەتی، ئەبو هورەیرە الله لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێت: (لا تَقُومُ السَّاعَةُ حتَّى تُقاتِلُوا اليَهُودَ، حتَّى يَقُولَ الحَجَرُ وراءَهُ اليَهُودِيُّ: يا مُسْلِمُ، هذا يَهُودِيٌّ وَرائي فاقْتُلْهُ).

واتا: (دونیا کۆتایی نایەت و قیامەت هەڵناسێت هەتا کوشتاری جولەکە دەکەن، هەتاوەکوو بەردیش دێتە قسەو دەڵێت ئەی موسوڵمان ئەوە جولەکەیەکە لە پشتمەوە وەرە بیکوژە).

هەروەها لەڕیوایەتێکی دیکە دەفەرموێت: (لا تقومُ الساعةُ حتى يقاتلَ المسلمون اليهودَ ، فيقتلُهم المسلمون، حتى يختبيءَ اليهوديُّ من وراءِ الحجرِ و الشجرِ ، فيقولُ الحجرُ أو الشجرُ : يا مسلمُ يا عبدَ اللهِ هذا يهوديٌّ خلفي ، فتعالَ فاقْتلْه . إلا الغَرْقَدَ ، فإنه من شجرِ اليهودِ).

واتا: (دونیا کۆتایی نایەت و قیامەت هەڵناسێت هەتا ئەوەی موسوڵمانان جەنگی جولەکە دەکەن، موسوڵمانەکان دەیانکوژن، پاشان جولەکەکان خۆیان حەشار دەدەن لە پشتی دار و بەرد، دار و بەردیش دێنە قسە لێیان ودەڵێن: ئەی موسوڵمان، ئەی بەندەی خوا ئەوە جولەکەیەکە لە پشتمەوە وەرە بیکوژە، تەنها داری غەرقەد نەبێت، چونکە ئەوە داری جولەکەیە).

بێگومان ئەو شەڕو کوشتاو جەنگانەش کە بەرامبەر جولەکە دەکرێت لە سەرنجامی ئەو هەموو زوڵم و ستەم و دژایەتیەی کە کردویانە بەرامبەر موسوڵمانان و ئەهلی ئیسلامیان کردوە بە درێژایی مێژوو، هەر لەسەرەتا هاتنی پیغەمبەر موحەممەد علیه الصلاة والسلام هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان، بەردەوامیش دەبێت هەتا کۆتایی دونیا!!

ئەم دوژمنکاریەش الله تعالی لە قورئاندا پێی ڕاگەیاندوین کە دەفەرموێت: (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا). واتا: (تۆ ئەی موحەممەد دەبینیت کە سەرسەختترین دوژمنی ئیسلام وئیماندارا‌ن، جولەکە و موشریکەکانن).

بەڵام بە دابەزینی پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام) وە کوشتنی دەججالی درۆزن، جولەکەش کۆتاییان پێ دێت و دەوڵەتەکەشیان تەواو دەبێت و لەناو دەچن شەڕو کینەو زوڵم و ستەمیشیان کۆتایی پێ دێت .

## ماوەی مانەوەی پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) لەناو ئوممەت لەدوای دابەزینی !!

دوای کوشتنی دەججال وجەنگ وشەڕو کوشتاری جولەکە و کۆتایی هاتنی دەوڵەتی ئیسرائیل، پێغەمبەری خوا عیسا (علیه الصلاة والسلام) سەرکردایەتی جیهان دەکات هەم وەکو پێغەمبەرێك هەم وەکو سەرۆکێك، بۆماوەی چەند ساڵێك لەسەر زەوی دەمێنێتەوە لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا عیززەت و شکۆی موسوڵمانان دەگەڕێتەوە و کوفر وشریك و زوڵم وستەم وگومڕایی کۆتایی پێ دێنێت!!

لەبارەی ماوەی مانەوەی پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) لەسەر زەوی چەند فەرمودەیەك هاتوە بە چەند ڕیوایەتێکی جیاواز، لەوانە: ئیمامی موسلیم لە صەحیح فەرمودەیەکی هێناوە کە عبدالله کوڕی عەمڕی کوڕی عاص الله لە خۆی و باوکی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە ئەمە بەشێك لە

فەرمودەکەیە هەروەکوو دەفەرمووێت:

(فَيَبْعَثُ اللهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ كَأَنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ، ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ سَبْعَ سِنِينَ ، لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَدَاوَةٌ ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللهُ رِيحًا بَارِدَةً مِنْ قِبَلِ الشَّأْمِ ، فَلَا يَبْقَى عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ أَوْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ).

واتا: (دوای ئەوەی الله تعالى عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێت، شێوەی وەکوو عوروەی کوڕی مەسعود وایە، دەججال دەکوژێت، پاشان لەناو خەڵکیدا حەوت ساڵ دەمێنێتەوە، کە لەو ساڵانەدا هیچ دوژمنایەتیەك لەنێوان خەڵکیدا نامێنێت، پاشان الله تعالى بایەکی سارد لە شامەوە دەنێرێت، هەرکەسێك لەسەر زەوی بەهێندەی میسقالە زەڕڕەیەك ئیمان لەدڵیدا هەبێت ڕووحی دەکێشرێت و دەمرێت).

لە ڕیوایەتێكی دیكەشدا ئەبو هورەیرە الله لێی ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە، دەفەرموویت: چل ساڵ دەمێنێتەوە لەسەر زەوی، هەروەكوو لەم بەشەی فەرمودكەدا هاتوە:

(يَلْبَثُ أَرْبَعِينَ سَنَةً ثُمَّ يُتَوَفَّى صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ). واتا: چل ساڵ دەمێنێتەوە لەناو موسوڵمانان پاشان وەفات دەكات و موسوڵمانانیش نوێژی لەسەر دەكەن .

هەروەها لە فەرمودەكەی دایكە عائیشە كە لە موسنەدی ئیمام احمد هاتوە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموویت: (ثُمَّ يَمْكُثُ ابْنُ مَرْيَمَ فِي الْأَرْضِ بَعْدَ قَتْلِ الدَّجَّالِ أَرْبَعِينَ سَنَةً). واتا: پاشان عیسای كوڕی مەریەم چل ساڵ دەمێنێتەوە لە دوای كوشتنی دەججال .

لە شەرحی ئەو دوو ماوەیەی كە لە ناو فەرمودەكاندا هاتوە، زانایان دەڵێن:

یەکەم: ماوەی مانەوەی تەنها حەوت ساڵە، بەپێی لێکۆڵینەوەی چەند زانایەك، لەوانە: پرسیار کرا لە ابن حەجەری هەیثەمی بەڕەحمەت بێت: پێغەمبەر عیسا ماوەی چەند دەمێنێتەوە لەسەر زەوی دوای دابەزینی؟ فەرمووی حەوت ساڵ هەروەکو لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە .

ئیمامی السفارینی بەڕەحمەت بێت دەفەرموێت: کۆکراوەی هەردوو فەرمودەکە ئەوەیە کە کاتێك عیسای کوڕی مەریەم هەڵکێشرا بۆ ئاسمان تەمەنی سی وسێ(٣٣) ساڵ بوو، لەدوای دابەزینیشی حەوت ساڵ دەمێنێتەوە، دەبێت بە چل ساڵ و وەفات دەکات .

دووەم : هەندێکی دیکە لە زانایان پێیان وایە چل ساڵ دەمێنێتەوە، ئەو حەوت ساڵەش کە لە فەرمودەکەی موسلیمدا هاتوە، ماوەی مانەوەی خەڵکە موسوڵمانەکەیە لە دوای وەفاتی عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام)!!!

چونکە لە فەرمودەکەدا دەفەرموێت خەڵکی حەوت ساڵ دەمێننەوە لەدوای وەفات کردنی ئەو !!!

بەڵام ماوەی مانەوەکەی هەرکامێکیان بێت، ئەوەی گرنگە بیزانین پێش ئەوەی وەفات بکات، جەنگێکی دیکەش بەرۆکی موسوڵمانان دەگرێت!!! ئەویش جەنگی یأجوج ومأجوج ە بە سەرکردایەتی خۆی، پاش ئەو جەنگە دونیا پڕ دەبێت لە خێرو خۆشیوعەدالەت ودادپەروەری کە ئەویش بەجێ گەیاندنی پێغەمبەرایەتیەکەیەتی لە کۆتایی زەماندا، چونکە ئەو کاتی خۆی ئەرکەکەی تەواو نەکرد!! هەڵگیرابوو بۆ ئاخری زەمان و ئەو ئەرکەی پێی سپێرابوو تەواوی بکات!!!

پاش ئەوەش وەفات دەکات و بۆ یەکجاری دونیا بەجێ دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە لای الله تعالی .

## کۆتا فیتنە وپەلەقاژەی شەیتان دژی موسوڵمانان (جەنگی یأجوج ومأجوج)

جەنگی یأجوج و مأجوج یەکێکی دیکەیە لە جەنگ و فیتنەکانی ئاخری زەمان کە لە ژیانی پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) ڕوودەدات کاتێك دابەزیوە ولەناو ئوممەتدایە، وە کۆتا جەنگی موسوڵمانان وپێغەمبەر عیسایە لەسەر زەوی، لەدوای ئەم جەنگە هیچ جەنگ وشەڕ وفیتنەیەك تووشی موسوڵمانان نابێت و دونیاش بەرەو کۆتایی دەڕوات !!

بێگومان (یأجوج و مأجوج) یەکێکی دیکەیە لە نیشانە گەورەکانی کۆتایی دونیا کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە چەندین فەرمودە باسی کردوە، هەروەها الله تعالی لە دوو جێگای قورئاندا باسی کردوە، ئەوانیش: (سورەتی الکهف، سورەتی الأنبیاء)، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا زیاتر جەختی لەسەر دەکەینەوە جەنگی ئەو دوو قەومەیە

لەگەڵ سوپای موسوڵمانان و پێشەواکەیانە.

سەبارەت بە جەنگی ئەو دوو گەلەش لەگەڵ سوپای موسوڵمانان، دەچینە خزمەت فەرمودەکەی النواس بن سمعان الله لێی ڕازی بێت، کە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) دەفەرمووێت: (فبينما هو كذلك إذ أوحى الله تعالى إلى عيسى صلى الله عليه وسلم : أني قد أخرجت عبادا لي لا يَدَانِ لأحد بقتالهم، فحَرِّزْعبادي إلى الطُّور ويبعث الله يأجوج ومأجوج وهم من كل حَدَبٍ يَنْسِلُون).

واتا: دوابەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی جولەکە و دەوڵەتی ئیسرائیل، الله تعالى وەحی دەنێرێت بۆ پێغەمبەر عیسا علیه السلام: کە کۆمەڵێك بەندەم بۆ ناردوون ئێوە ناتوانن جەنگیان لەگەڵدا بکەن، بەندەکانی خۆم بەرەو کێوی طور ببە(واتا:سوپای موسوڵمانان)، پاشان الله تعالى یأجوج ومأجوج دەنێرێت و لە هەموو لایەکەوە هێرش دێنن بۆ کوشتاری پێغەمبەر عیساو سوپای موسوڵمانان .

بەڵام بەفەزڵ و منەتی الله تعالی، جۆرە کرمێکیان بۆ دەنێرێت بەناوی (النغف)، کە لەناویان بڵاودەبێتەوە ولەناویان دەبات، بەوجۆرە هێزی یأجوج ومأجوجیش لەناو دەچن و کۆتاییان پێ دێت، پاشان لە دوای کۆتایی هاتنی ئەوان چی دیکە، هیچ جەنگ و فیتنە و ئاشوبێك بەرۆکی موسوڵمانان ناگرێت!! هەروەکوو لەم بەشەی فەرموودەکەی النواس بن سمعان هاتوە:

(فيُرسِلُ اللهُ عليهم النَّغفَ في رِقابِهم، فيُصبِحونَ فَرْسَى كموتِ نَفسٍ واحِدةٍ، ثُمَّ يَهبِطُ نَبيُّ الله عيسى عليه السَّلامُ وأصحابُه إلى الأرضِ، فلا يَجِدونَ في الأرضِ مَوضِعَ شِبرٍ إلَّا مَلأه زَهمُهم ونَتْنُهُمْ، فيَرغَبُ نَبيُّ الله عيسى وأصحابُه إلى الله، فيُرسِلُ الله طَيرًا كأعناقِ البُختِ فتَحمِلُهم فتَطرَحُهم حَيثُ شاءَ اللهُ، ثُمَّ يُرسِلُ اللهُ مَطرًا لا يَكُنُّ مِنه بَيت مَدرٍ ولا وَبَرٍ، فيَغسِلُ الأرضَ حَتَّى يَترُكَها كالزَّلفةِ).

واتا: الله تعالی کرمی (النغف) یان بۆ دەنێرێت لە گەردنیان دەدات،

هەموویان دەکوژێت پاشان پێغەمبەرعیسا (علیه الصلاة والسلام) و سوپای موسوڵمانان لەسەر کێوەکە دێنە خوارەوە، کاتێك دەبینن کە زەوی پڕ بوە لە بۆگەنی وکەلاکی ئەو دوو قەومە بەهۆی تیاچونیان بەو کرمە !!! هەربۆیە پێغەمبەر عیساو موسوڵمانان دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە لە الله تعالی ئەو موسیبەتەیان لەکۆڵ بکاتەوە، الله تعالی باڵندەیەکی مل درێژیان بۆ دەنێرێت و کەلاکەکەیان هەڵدەگرن و لە شوێنێکی دیکە فڕێی دەدەن، دوابەدوای ئەوەش الله تعالی بارانێکیان بۆ دەبارێنێت و زەوی پاك دەبێتەوە .

دوابەدوای ئەو جەنگە و پاك بوونەوەی زەوی، پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) حوکم لەسەر زەوی دەکات بۆ چەند ساڵێك، زەویش پڕ دەبێت لەخێر و بەرەکەت و پاشان وەفات دەکات و بەیەکجاری دەگەڕێتەوە لای الله تعالی، لە دوای وەفات وگەڕانەوەی عیسای کوڕی مەریەم (علیه الصلاة والسلام) بە ماوەیەکی کەم (بە

ئەمری الله تعالی بایەکی سارد دەنێرێت) موسوڵمانان وەفات دەکەن و هیچ موسوڵمانێك لەسەر زەوی نامێنێت !! لەکۆتاییشداخراپترینی مرۆڤەکان لەسەر زەوی دەمێننەوە وقیامەتیش لەسەر ئەوان بەرپادەبێت !!!

**تێبینی:**

١. ئەم جەنگ و فیتنانەی لەم زنجیرەیەدا باسمان کرد، هەمووی بە فەرمودەی خۆشەویستمان (علیه الصلاة والسلام)، پشتڕاست کراوەتەوە، ئێمەش لەسەر بنچینەی ئایەت و فەرموودەکان باسمان کردوە وشەرحمان کردوە ئەگەر پێکابێتمان ئەوە بەدڵنیاییەوە لە الله تعالی وە بوە، ئەگەریش نەمان پێکابێت ئەوە لە نەفسی خۆمان و شەیتانەوەیە.

٢. بۆ زیاتر ناسین وشارەزابوون لەو دوو قەومە:(یأجوج و مأجوج)، کتێبێکی تایبەتمان لەسەر نوسیوە بە ناوی: (یأجوج ومأجوج و سەردەمی نوێ)، دەتوانن سوودی لێ وەربگرن، ئەمەش لینکی کتێبەکەیە:

AC-%٨D%٨٨%٩AC%D%٨D%٦A%٨D%٩٥%C%DB٨%/%DB٥wy٠fgpb٦٣i٧f٦١https://www.mediafire.com/file/
-٨٨%٩AC-%D%٨D%٨٨%٩AC%D%٨D%٦A%٨D%٩٥%DB%٨٥%٩-%D٨٨%٩%D
-١E-٨%DB%٨٨%٩D%٨٦%٩C-%D٨%DB%٨٥%٩D%٩٥%AF%DB%٨D%١B%٨D%٩٥%DB%٣B%٨%D
dWrev-٢_a٦٩Caj٤DqgLo٥FlbQIxMQABHTZUMKdgbsHaqv٢VleHRuA٠c٢xjawI٢.pdf/file?fbclid=IwY١
HfQxAQ٧K-eA_aem_qraycOYrZTTlnZF٧Y٩IwjlhujX٦JOHM٥KF

والله اعلى واعلم ولا غالب إلا الله.

اللهم أحسن خاتمتنا في الأمور كلها، وثبتنا على الحق في جميع أحوالنا، ومُنَّ علينا بالثبات على دينك في الحياة وعند الوفاة.

والحمد لله رب العالمين ، وصلى الله تعالى على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم .

براتان: كاوه اسعد

# ناوەڕۆک